ناوەندی ڕەها
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەری گشتی ناوەند:
زامدار قادری
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە:
ئەیاد نادر
بەڕێوەبەری هونەری ناوەند:
محمد جبار

هەولێر - بازاڕی ڕۆشنبیری - تەنیشت پارێزگا
Raha/ڕەها
٠٧٥٠ ٤٠٦ ٦٦٧٤

# هونەری جەنگ

یەکەمین کتێبی بواری سەربازی لە مێژوودا

نووسینی: سون تزو
وەرگێڕانی: نیاز مەستی

ناوەندی ڕەها
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

ژمارەی بڵاوکراوە: 5

ناوی کتێب: هونەری جەنگ
نووسینی: سون تزو
وەرگێڕانی: نیاز مەستی
دیزاینی بەرگ: محمد جبار
ساڵی چاپ: ٢٠١٩
تیراژ: ١٠٠٠ دانە
نرخ: ٣ هەزار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٦٦٨) ساڵی ٢٠١٥

## پێشکەشە بە:

بەهەموو کوردێک لەسەر ڕووی زەوی ، بە هەموو ئاشتیخوازێکی دونیا

بە پارێزەرانی خاکی کوردستان، پێشمەرگە نەبەردەکان کە هەموان وامداری ئەوانین.

هەموو ئەوانەی لە کاروانی زانست باربویان کردین بە تایبەت: م.علی حاجی خدر، م.هیوا ئەحمەد ، م.نهرۆ عوسمان

## دەستخۆشی:

لە هەموو ئەو هاوڕێیانە دەکەم بە دەست خۆشیەکیش بێت یارمەتیان دام، بە تایبەتی ئەو مامۆستا بەڕێزانەی کە ئەرکی چاوپێداخشاندنەوەیان لە ئەستۆ گرت: م.هیوا علی و م.ئاسۆ و دایکی و م.دەشتی رسول و م.شەوقی زرار و د.هەردی شێروانی و م.عبدالخبیر بکر و شوان حەسەن

# پێرست

## باروودۆخ وسەردەمی نوسینی ئەم کتێبە

ئەم کتێبەی بەردەستت بەزمانی چینی و لەولاتی پان و بەرینی چین نوسراوە. شایەنی باسە چین ولاتێکە کەوتۆتە ڕۆژهەلاتی کیشوەری ئاسیا.چین ڕووبەرێکی زۆری بۆخۆی داگیرکردوە کە ٩, ٥ ملیۆن کم$^{2}$ یە. ئەم ولاتە لەئەلفی شارستانی و ئاوەدانی بەشداربووە و تا ئیستاش لەمەیدانی وجوددا کارایە. پێشنیارم بۆ خوێنەری بەڕێز ئەوەیە کە بچێت کتێبێکی گشتگیری ولاتان بخوێنێتەوە ئاخۆ سەرسام دەبیت یان نا لەئەنجامیش دەلێت وای ئەم ولاتە کەونارایە چەندە ڕەگێکی دیرۆکی چەسپاوی هەیە؟! هەمیشە چین لەیەکلاکردنەوەی ڕەوتی مێژوو ڕۆلی هەبووە. هەروەها چین مێژویەکی ئێجگار دوورودرێژی لەگەل داگیرکردن و شەڕو پێکدادانی دەرەکی و ناوخۆیی، سەرکەوتن و تێکشکاندنی سیاسی و سەربازی، شەڕی ڕزگاریخوازی و شەڕی ئایدۆلۆژیا هەیە.



## بۆ زانياريت!

ئەم كتێبە لەسەردەمی فەرمانڕەوايی تسۆ Zhouنوسراوە. ئەم فەرمانڕەوايە لەنێوان سالآنی ١٠٤٦ تا ٢٥٦ پ.ز حوكمڕانی كردوە. ئەم فەرمانڕەوايە لەلايەن خێڵی Zhou دروست كراوە. لەساڵی ١٠٤٦ پ.ز توانيان كۆتايی بە حوكمی فەرمانڕەوايی شانگ Shangبهێنن. لەسايەی ئەم فەرمانڕەوايیەدا شارستانی چينی هەنگاوێكی ئێجگار گەورەی هاوێشت.



فەرمانڕەوای تسۆ توانيان بەشێكی زۆری باكوری چين داگيربكەن و حوكمی بكەن تاسنوريان گەيشتە كەنارەكانی ڕوباری جانگ تسی كيانگ (jantse kiang:ڕوبارێكە لەنزيك شاری شانگەهايە و دەڕژێتە زەريای هێمنەوە).

به گشتی حوکمی تسۆ توندوتوڵییەکی دەوڵەتی گەورەی پێوە دیار بوو. هەرچەندە ئەمانەش نەیانتوانی کۆتایی بەحوکمی ناوچەیی بهێنن، لێ توانیان حوکمێکی سەنتراڵی بەهێز دروست بکەن و شاری هایۆ (hao) کە ئەمڕۆ خیای (xia) پێدەڵێن بکەنە پایتەختیان. هەروەها لەڕۆژهەلاتیش لە شاری لۆیی (Loyi)پایتەختێکی تریان دروست کرد.

کشتوکاڵ بڕبڕەی پشتی ئەم فەرمانڕەوایە بوو هەر بۆیە حکومەتێکی دەرەبەگایەتییان هەبوو.



## نوسین و وەرگێڕانی هونەری شەڕ

خوێنەر مافی هەیە پرسیار بکات:

**بۆچی سون تزو ئەم کتێبەی نوسیوە؟**

**ئەم کتێبە چۆن وەرگێڕدراوە؟**

**هونەری شەڕێ بەکەڵکی چی دێت؟**

**بابێینە سەر وەرامی کوتی یەکەمی پرسیارەکە:**

مێژوو دەڵێت نوسینی ئەم کتێبە لەسەر داوای پاشا هوو لوو بووە. ئەمە وەڵامێکی کورت و خێرایە بەڵام کە بچینە بناوانی هۆی نوسین پێم وایە هەویرێکە ئاوی زۆری گەرەکە چ جا باسی شەڕ بێت.

خۆ لەوەتەی دانیشتوانی زەوی لە پێنج شەس کەس زیادی کردووە تاوەکو ئێستا کەلەحەوت ملیارد تێپەری کردوە مرۆڤ وازی لەبەربەرەکانێ و ملشکاندنی یەکتر نەهێناوە. لەوەش سەیرتر بەهانەشی بۆ ئەو شەڕ و ناکۆکیە دۆزیوەتەوە. جا بەهانەکە چ ئایینی بێت یا کۆمەڵایەتی یا سیاسی ... هتد.

لە سۆنگەی ئەوەی مرۆڤ خاوەنی ئاوەز و هزرێکی گەورەیە هەرجارە و پەندێك یا وانەیەکی لەو شەڕانە وەدەست کەوتوە. جا هەرشتێك زۆر دووبارە ببێتەوە ڕاز و کۆدەکانی ئاشکرا دەبن.

بۆئەوەی ڕازی ئەو پەندانە لەبیری خەڵك نەچنەوە سون تزو هەستاوە ئەم بیرۆکانەی خۆی و خەڵکی پێش خۆی یاداشت کردوە و ماندوبونێکی بەبەرهەمی ئەنجامداوە تا کتێبێکی ئاوای لێ بەرهەم هاتووە.

ئەم کتێبە لە ٦٠٠٠ نیشانەی چینی پێکهاتوە (زمانی چینی بە نیشانە دەنوسرێت ئەم زمانە لە ٥٠ هەزار نیشانە (وشە) پێك هاتوە لێ تەنها ٨٠٠٠ هەزاری بۆ کاری ڕۆژانەبەکاردێت). سون ئەم کتێبەی لە ١٣ بەشدا نوسیوە هەربەشێکی بۆ کاروبارێکی شەڕ نوسراوە . جگە لەناوی (هونەری شەڕ) چەندەها ناوی تر بەسەر ئەم کتێبە براوە لەوانە: یەکەمین کتێبی سەربازی لە جیهان، کتێبی پیرۆزی سەربازی .... هتد. لەم کتێبە چەندەها شێوازی ستراتیژ[١] و تاکتیك[٢] باسیان لێوە کراوە.

بزانە ! سون بەرنامە و ڕێسای بۆ شەڕی مرۆڤانە داناوە چەندەها مەرجی بۆ دەستپێکردنی شەڕ داناوە کەئیش تا نەگاتە قاڤ خۆی شەڕی لەپێناو نەکەیت، خۆ ئەگەر کاتی گونجاوی خۆی هات شەڕو ...... بەدەست خۆت نییە خۆ هەندێ جار شەڕ دەرگات لێدەگرێ.

سون ویستویەتی باسکی حەق بەهێز و بە توانا بێت. هەتا بۆی کرابێت بەرچاو ڕوونی پیشان داوە. خۆ ڕاستە شەڕ ئاگرە ، ئاگریش دەست دەسوتێنێ ، لێ دەست بۆ گەرمکرنەوە پێویستی بەئاگرە !

تۆ شەڕخواز مەبە لەسەر ڕێگایەکی ڕاستی ئەدی چی دەکەی کە شەڕیان پێ فرۆشتی و تۆش هیچت لەشەڕ نەدەزانی؟

**با بێینە سەر لەتی دووەمی پرسیارەکەمان، مێژووی وەرگێڕانی ئەم کتێبە چۆن بووە؟ جا خۆ ئەگەر ئێمە زمانی چینی نەزانین چۆن لەم کتێبە بەهادارە تێبگەین؟**

یەکەمین وڵات دوای وڵاتی چین ژاپۆن بوو کە ئەم کتێبەی تێدا بڵاوبویەوە گەورە سوارچاکانی سامۆڕای زۆر خۆیان بە شرۆڤە کردن و جێبەجێکردنی بەندەکانی ئەم کتێبە خەریک دەکرد.




پاش چەندەها ساڵ کەسێکی فەڕەنسی ئەم کتێبەی لەساڵی ١٧٧٢ وەرگێڕایە سەر زمانی فەرەنسی. پاش ماوەیەك وەرگێڕدرایە سەر زمانی ئینگلیزی و ئەڵمانی...

ئێمە زیاتر دەربارەی چاپە ئینگلیزییەکە دەدوێین کە وەرگێڕانەکەی دکتۆر لیۆنێل جیلزە (Lonel Gilles).

د.جیلز ئەندامی بەشی دەستنوس و کتێبی چاپکراوی ڕۆژهەڵاتی بووە لە مۆزەخانەی بەریتانی لەشاری لەندەن ئەم کتێبەی لەزمانی چینییەوە وەرگێڕایە سەر زمانی ئینگلیزی لەژێر ناونیشانی ( Sun Tzu on The Art of war)، پێش وەرگێڕانەکەی د.جیلزیش

چەند وەرگێڕانێکی تریش هەبوون بەڵام پڕ لە هەڵە و کەموکورتی بون. وەرگێڕانەکەی د.جیلز لەوانەی پێش خۆی باشتر بون چونکە د.جیلز هەم پاشخانێکی لە بواری سەربازیدا هەبوو، هەم بەجوانی زمانی چینی دەزانی و سەردەمانێکیش نوێنەری حکومەتی بەریتانیا بووە لە چین ئەم کتێبە لەساڵی ١٩١٠ لەشاری لەندەن و شانگاهای لەلایەن لۆزاك و کۆبو بڵاوکرایەوە.

دوای وەرگێڕانەکەی د.جیلز لەساڵی ١٩٦٣ وەرگێڕانێکی تری ئەم کتێبە لەلایەن ساموێل گریفس کرا. ئەم وەرگێڕانەی ساموێل لەوەرگێڕانەکەی د.جیلز ڕوون و ئاشکراترە هەروەها چەندەها تێبینی و شرۆڤەی ڕەخنەگران و لێکۆڵەرانی لەخۆگرتووە.

نابێت ئەوەش فەرامۆش بکەین کەتا ئێستا ئێمە چوار وەرگێڕانی ئەم کتێبەمان بەزمانی عەرەبی بینیوە و لەهەندێکی سودی چاکمان وەرگرتوە.

چاپە عەرەبیەکانی ئەم کتێبە:

١- سمير خادم (مؤسسه دار الريحانی)
٢- محمود حداد (دار القدس)
٣- رؤوف شبايك ٢٠٠٧(لە ئینتەرنێت)
٤- اكرم مؤمن٢٠٠٦(دار الطلائع-القاهره)

ئەم وەرگێڕانانە و وەرگێڕانەکەی د.محمد هادی مؤذن جامی ١٣٨٩(بەزمانی فارسی) زۆربەیان وەرگێڕانەکەی د.جیلزیان کردۆتە سەرچاوە و بۆ سەر زمانی خۆیان وەریانگێڕاوە.

پاش ئەوەی هۆی نوسین و کاری وەرگێران و کەڵکی ئەم کتێبەت بۆ دەرکەوت ، هێشتا بیانوێك لەلای خوێنەر ماوە بڵێت خۆ ئێمە زمانی چینی یان ئینگلیزی نازانین دەی چۆن موتاڵای ئەم کتێبە بکەین؟ لەوەرامدا دەڵێم: سەرباری چەند تەگەرەیەك[٣] لەبەردەم وەرگێڕانی ئەم کتێبە بەڵام بۆ ڕەواندنەوەی ئەم بیانوەش ناوی خودامان لێهێنا و کردمانە کوردی[٤].

بەڵام یەکێ وتی: خۆ تۆ هەستی ئەدەبیت هەیە بۆچی بەلای باسی شەڕ و کوشتار دادەچی و ئۆین بۆ کوشتن دەدۆزیتەوە؟ وەرامی ئەم پرسیارەتان عەرزدەکەم: زمانی کوردی وەکو هەموو زمانە زیندووەکانی تری جیهان ئاخێوەری زۆری هەن، بۆچی لەم بەهرەیە بێبەش بین؟ هەروەها میللەتی کورد دوژمنی زۆری هەیە ئەو دوژمنانە لەهەوڵی دروست کردنی تەگەرە و لەمپەرن زۆریان دەیانەوێت ئێمە ماندووبین لەنێوان دووریانێکدا ، هەرچەند بڕۆین ماندووتر بین و لە شوێنی خۆشمان بمێنینەوە . بۆتەختکردنی ئەم لەمپەرە و دەست بڕینی ستەمکاران و نەیارانی گەلی کورد و زمانی کوردی، ئێمە ناچاری شەڕێکی پیرۆزین جا کوردی مەرد ئەو

بنەمایانەی سون تزو بۆ گەیشتن بە ئاواتەکانت بەکاربێنە مافی خۆتی پێ بستێنە، چاوی دوژمن دەربێنە، هەردوو دەستی نەیار بشکێنە.

وریابە! پەلاماری هیچ ژیاندارێك مەدە بەڵام ئەگەر زیاندارێك ویستی زەرەرێکت پێ بگەیەنێ بەرەوانی بکە چۆن؟ بە کتێبی هونەری شەڕ

**با بێینە سەربەشی کۆتایی پرسیارەکەمان:هونەری شەڕ بەکەڵکی چی دێت؟**

بۆ ساناکردنی وەرامی ئەم پرسیارە چەند خاڵێك دەخەمە ڕوو:

١- کتێب وەك تەمەنی مرۆڤ وایە هەندێ بەمردووی لەدایك دەبن هەندێك دە ساڵ هەندێ پتر، هەندێ سەد، هەندێکی کەمیش نەمرن، تا مانی ژین لەسەر زەوی باسیان ناسڕێتەوە.

بەپێی داتای زانستی لەدەهەزار کتێب یەك کتێب بەنەمری دەمێنێتەوە، کتێبی هونەری شەڕ یەکێکە لەو کتێبانە.

٢- دوای تێپەڕبونی زیاتر لە ٢٥٠٠ ساڵ هێشتا بنەما و ڕێساکانی ئەم کتێبە کاریان پێدەکرێت تەنانەت زۆر بەبایەخەوە سەیر دەکرێن. لەسەر ئاستی جیهان ئەم کتێبە دانی پێدانراوە.

٣- کتێبخانەی بواری سەربازی (بەتایبەتی کوردی) زۆر هەژارە بۆیە ئەم کتێبە کەلێنێکی گەورە پڕدەکاتەوە.

٤-ئەم کتێبە بۆ زیاتر لە ٢٥ زمانی زیندووی جیهانی وەرگێردراوە وەکو: ژاپۆنی ، ئەڵمانی ، فەرەنسی ، فارسی ، عەرەبی ، سویدی ، کوردی...هتد.

٥-تا ئێستا چەندەها کۆڕ و سیمینار دەربارەی ئەم کتێبە ئەنجامدراوە.

٦-سود و کەلکی ئەم کتێبە تەنها بۆ بواری سەربازی نییە بەڵکو لەسەر رێسا گشتیەکانی ئەم کتێبە چەندەها کتێب و لێکۆڵینەوە و شرۆڤە و شیکار لەبوارەکانی ئابوری، بازرگانی، تەنانەت وەزرشی ئەنجام دراوە. پێم باشە لەسایتەکانی ئینتەرنێت بگەڕێیت ئەوجا بۆت دەردەکەوێت بەهای ئەم کتێبە چەندە؟

٧-چەندەها کەسایەتی ناودار و سەرکردەی سەربازی لەسەردەمانی کۆن و ئێستاشدا بەبایەخەوە لەم کتێبەیان ڕوانیووە وەکو: پاشا هوو لوو ، سامۆڕای ، ناپلیۆن پۆناپارت ، ماوتسی تۆنگ...هتد.

٨-زۆر لەئەکادیمیا و قوتابخانە سەربازی و هێزە چەکدارەکان سود لەم کتێبە وەردەگرن وەکو بابەتێکی خوێندن بەکاری دەهێنن.

٩-ڕاستە ئەم کتێبە باسی شەڕ و کوشتار دەکات بەڵام هەرگیز ڕەوشتی جوان و بەجێی فەرامۆش نەکردوە. بەندی ٤٣ بەشی نۆیەم باسی شەڕ دەکات بەڵام مرۆڤانە باسی دەکات.

١٠-هێزی ئەمەریکی لەڕزگارکرنی کوێت داپێداگیری لەسەر ئەوە دەکرد کە پێویستە هەموو سەربازێکی ئەمریکی کۆپیەکی ئەم کتێبەی لەلابێت و بیخوێنێتەوە .

١١- کۆمپانیا ژاپۆنییەکان چەندەها کۆڕ و سیمیناریان ئەنجام داوە بۆ تێڕامان و گەنگەشەی بەندەکانی ئەم کتێبە. کۆمپانیا چینییەکان ئەم بنەمایانەی کە سون تزو دایناون، لەکاروباری دەستگرتن بەسەر بازاڕگەی دەرەوە جێبەجێ دەکەن. کاتێك کۆریای باشور توشی پاڵەپەستۆی دەرەوە بوو لەبواری بازاڕگەری بنچینەکانی ئەم کتێبەی بەکارهێنا.

١٢- لە دوو توێی ئەم کتێبە چەند زانیاریەکی گرینگی مێژوویی سپارێزراون.

١٣- گەورە سەرکردەکانی سەربازی دەبێژن: ئەگەر بنەماکانی ئەم کتێبە لەبەرچاو گیرابان هەرگیزاو هەرگیز ئەو هەموو کوشتن و کوشتارە لەجەنگی جیهانی یەکەم و دووەم ڕوویان نەدەدا.

١٤- پێت وانەبێت ئەم کتێبە ماوەیەکی زۆری بەسەر تێپەریووە و بەسەرچووە. بەڵکو شایەنی ئەوەیە خوێندنەوەی نوێ و تازەی بۆ بکرێت و لەگەڵ بارودۆخی ئێستا بگونجێنرێت، خۆ زێڕ و زیو با کۆنیش بن نرخی خۆیان لەدەست نادەن.

١٥- هەر بەندێك پێویستی بە ڕوونكردنەوە بێت پەراوێزمان لە كۆتایی بەشەكە بۆ داناوە (زۆربەی پەراوێزەكانم لە شەرحەكانی كتێبەكە وەرگرتووە). لە كۆتایی هەر بەشێكدا پوختەیەكی كورتی بەشەكەمان نوسیووە تا خوێنەر ئاسانتر بگاتە كاكڵەی بەشەكە.

١٦- دوا خاڵی زۆر گرینگ! لەم كتێبە تەنها باسی سەركەوتن نەكراوە بەڵكو بەزەقی و ئاشكرایی باسی شكست و دۆڕانیش كراوە تا لەخۆباییبون باڵمان بۆ دروست نەكات.

**پەراوێزەكان:**

(١) ستراتیژی: strategy

وشەیەكی گریكییە(strategos-strategia) نەخشەی ئاڕاستەكردنی هێزی چەكدارییە بۆ هەر جموجۆڵ و بزاوتنێك. هەروەها هونەری پلاندانان و شەڕكردنە.

٢) تاكتیك: پێچ و پەنا: tactic

١-چالاكیەك یان ستراتیژیەكی زیرەكانەی بە پلان بۆ وەدەستخستنی مەبەستێك.

٢-هونەری نەخشەدانانی شەڕە، هەموو ئەو شێواز و هۆكارانە دەگرێتەوە كەبەپێی نەخشەیەك بەرێوەدەچن. تاكتیك بەشێكە لە ستراتیژی.

٣) تەگەرەكانی بەردەم وەرگێڕانی ئەم كتێبە:

یەکەم- ئاڵۆزی ڕستەکان: لەبەرئەوەی من زمانی چینی نازانم (وابزانم دەقە ڕەسەنەکەی ئەم کتێبە هەر نەماوە) بۆیە دەقی زمانی دووەم (ئینگلیزی، عەرەبی، فارسی) لەبەردەستی ئێمە بوو. هەندێ شوێن و ڕستەی سەختی تێدا بوو کە تێگەیشتن لێیان زەحمەت بوو.

دووەم- بیرۆکەی دەقەکە: جاری واهەیە کە بیرۆکەکانی نێو بەندێك تەباو پێکەڵ نین.

سێیەم- سیستەمی ژمارەیی: دەقی بەردەستی ئێمە لە ڕووی ڕیزبەندی ژمارەییەوە (٣، ٢، ١......) بۆ ئەژمارکردنی بەندەکانی بەشێك و خاڵەکانی نێو بەندێك بەکارهێناوە.

چوارەم- پەیوەستی بەندەکان: لەهەندێ شوێن چەند دێڕێك یەك بیرۆکەیان هەیە کەچی بەچەند بەندێکی جیا وەك لە دانراون بەندی ٥, ٤ لەبەشی دەیەم جاری واش هەیە چەند دێڕێکی لەیەك جودا خراونەتە قەفەسی یەك بەند وەکو بەندی ٣٢ لەبەشی نۆیەم.

٤) لە وەرگێڕانی ئەم کتێبە سەیری چەند فەرهەنگێکم کردووە لەوانە:

١- فەرهەنگی کاوە ب ١ ، ٢، ٣ عەبدوڵا ئیبراهیمی دەزگای ئاراس

٢- فەرهەنگی شیرین عربی -کوردی فاضل نظام الدین ٢٠٠٩ سلیمانی

٣- فەرهەنگی ئازادی د.حمەرەشید قەرەداخی چاپی یەکەم ٢٠٠٩ اسوە

# ژیاننامەی سون تزو

سون تزو (Sun Tzu) کە بەفەیلەسوفی سەربازی، سوپاسالاری مەزن، فرەزانی چینی، باوکی هونەری شەڕ ناوزەدکراوە) سەرلەشکری شانشینی وو(WU) بووە. سون لەساڵی ٥٥١ پ.ز لەدایك بووە و لەکۆتای سەردەمی (بەهار و پاین) ژیانی بەسەر بردووە. کاتێك کە کۆمەڵگەی چینی لە کۆمەڵگایەکی دیلی و بەندەیی بۆ کۆمەڵگەیەکی دەرەبەگایەتی (فیوداڵی) گۆڕاوە.

بەشێوەیەك کەشەڕێکی زۆر لە نێوان ١٣٠ میرنشینی گەورە لەسەر دەسەڵات و پایە سەری هەڵداوە. ئەم شەڕانە زۆر درێژەیان کێشاوە.سون ئەزمونێکی زۆری لەو هەموو شەڕەپەیداکردوە. هەروەها گەشتێکی بۆ شانشینی وو کردوە لەڕۆژهەڵاتی چین (کە ڕۆژئاوای شاری شانگەهای ئەمرۆیە).



نوسراوە چینییەکان دەگێڕنەوە کە سون تزو وو هاونیشتمانی و سەربازێکی شانشینی تسو (Zhou) بووە. بەهۆی ئەو ئەزمونە زۆرەی کە هەیبوو دوو لەسەرکردە مەزنەکانی سەربازیی داوایان لەپاشا هوو لوو کرد کە سون تزو ڕابسپێرێ بۆ نوسینی کتێبێك.بۆیە پاشا داوای لە سون تزو کرد کە پوختەی ئەزمون و بۆچونی خۆی بنوسێتەوە.دوای تەواوکردنی هەر سێزدەبەشی کتێبەکە، پاشا موتاڵای کتێبەکەی کردو بە سونی گووت: ئەرێ دەتوانی لەژێر ڕۆشنایی ئەو ڕێساو بۆچونانە بۆ کاروباری شەڕ تاقیکردنەوەیەکی سادەی سەربازیمان نیشان بدەی ؟

سون ئەرێیانە وەرامی پاشای داوە .پاشا وتی:دەکرێت بەتاقیکرنەوەکەت لەسەر ئافرەتان جێبەجێ بکەی؟ سون وتی: ,بەڵێ خاوەن شکۆ زۆر ئاساییە. دەمودەست سەد وهەشتا ئافرەتی دەربارەی کۆشکیان ئامادەکرد.سون ئافرەتەکانی کردە دوو کۆمار:هەرکۆمەرە و سەرکردەیەکی و بۆ دیاریکردن و بەرگی سەربازیان پۆشی و شیرو خەنجەریان دانە دەستێ.سون وتی: "ئاگاداربن ئافرەتان با فێرتان بکەم پێش و پاش دەستە ڕاست و دەستە چەپ چییە".ئافرەتەکان وتیان بەڵێ. سون وتی:"کە دەنگی تەپڵ هات و وتم: بۆلای ڕاست بسوڕێن یەکسەر بۆلای ڕاست بسورێن.کە تەپڵ لێیداو وتم: بکشێنەوە دواوە دەبێت یەکسەر بکشێنەوە. هەموو ئافرەتەکان وتیان: "بەچاکی تێگەیشتین و

ئامادەی فرمانین". پاشا لەنزیك شوێنی ڕاهێنانەکەوە وەستا بوو لەوکارەی دەڕوانی.

سون فەرمانی بە ئافرەتەکان کرد: بۆلای چەپ بسوڕێن ئافرەتەکان لە دریقەی پێکەنینیان دا گوێڕایەڵی سونیان نەکرد. سون لەدڵی خۆی وتی:لەوانەیە تێنەگەیشتبن با دووبارەی بکەمەوە فرمانی کرد و وتی:" بۆلای ڕاست بسوڕێن"ئافرەتەکان ڕاقەنان لەگەڵ پێکەنین. سون بەخۆی گوت لەوانەیە لە فرمانەکەم نەگەیشت بن با سێ بارەی بکەمەوە، دەنگی تەپڵ هات، ئافرەتەکان لەسەر گازری پشتێ کەوتن هێندە پێکەنین وایان دەزانی نەبایە و نەبارانە.

سون کە دیتی فرمانەکانی جێبەجێ ناکرێن داوای کرد کە دادوەری سەربازی کێشەکە یەکلایی بکاتەوە. دادوەری سەربازی ئامادەبوو. سون بە دادوەرەکەی وت: "سزای ئەو سەربازە چییە کە لە مەیدانی شەڕێ ملکەچی فرمانی سەر لەشکر نەکات؟ "دادوەر وتی: "سزای ئەو سەربازە ئەوەیە کە سەری بپەڕێنرێت "بۆیە سون بڕیاریدا لەسەری هەر دوو سەر کۆمەران بدەن. بەڵام پاشا پەیامێکی نارد: ئێمە لەتوانای ئەفسەری خۆمان دڵنیابوین کە دەتوانێ ڕاێبەری سەربازان بکات ئەگەر چاوپۆشی لەسزادانی ئەو دوو کەنیزەیە نەکات من نان و ئاوم نامێنێت. هیوادارم کەلەسەری ئەو کەنیزەیە نەدەیت. سون وەرامی پەیامەکەی پاشای دایەوە و نوسی: من بەداوا و فەرمانی ئێوە سەرکردایەتی چەکداریم وەرگرتوە لەبەر ئەو

فرمانەی جەنابتان، ناتوانم داواکاریەکەتان جێبەجێ بکەم هەر بۆیە لەبەردەم هەموو ئافرەتەکانی تر لەسەری هەردوو سەر کۆمەرەکەی پەڕاند.

یەکسەر دوو ئافرەتی تری بەسەر کۆمەر دانا و ڕاهێنانەکەی دوبارە کردەوە. هەرکە ئافرەتەکان دەنگی تەپڵیان دەبیست بەڕێك و پێکی گوێڕایەڵی فەرمانەکان دەبون بەبێ ئەوەی یەك بزەش بکەن (کوتەك دەزانی قۆناغ لە کوێیە). ئەوجا سون هەواڵی بەپاشا دا کە ڕاهێنانە سەربازیەکان تەواوبون و ئامادەی هەموو شتێکین. بەڵام پاشا وەرامی نارد: کە ڕاهێنانەکان ڕابگرێ و خەریکی پێگەیاندنی سەرکردەی سوپایی بێت چونکە من ئارەزوم لەسەیرکردنی نمایشی سەربازیی ئافرەتان نییە.

لەم کاتەدا سون وتی: خولیای پاشا هەر قسەیە و ناتونێ چ بکات! پاشا هوولوو بڕیاری دا کە سون تزو بکرێتە سەرکردەی گشتی سوپا. بۆ شەڕی شانشینی تشۆی هاوسێی نارد. سون توانی ئەو شانشینە بڕوخێنێت و(ینج)ی پایتەختیشیان داگیر بکات. پاشان بەرەو باکور ڕۆیشت تا ترسی لەناو هەردوو شانشینی تشی و تشن بڵاوکردەوە. توانی سەرکەوتن لەدوای سەرکەوتن بەدەست بهێنێت تاوەکو شانشینی هوولوو زۆر فراوان بوو. لەکتێبە کۆنەکانی چیندا هاتووە سون بە سی هەزار سەرباز توانیویەتی بەسەر دوو سەد هەزار سەربازی دوژمن زاڵ بێت.

شتێك هەیە كە بەباشی دەزانین خوێنەرانیش بیزانن ئەویش ئەوەیە بەهۆی تێپەڕبوونی ئەو هەموو سەدەیە زۆر بیروڕا دروست بوینە. لەوانە هەندێك دەڵێن سون تزو هەر بونی نییە و كەسانێك ئەو ناوەیان دروست كردوە. هەندێكی تر دەڵێن كە دۆست و هەوادارانی سون زۆر شتیان لەسەر كتێبەكەی زیاد كردووە. هەندێك سەرچاوە دەڵێن كە ئەم كتێبە لەبنەڕەتا ٨٢ بەش بووە بەشە زۆرەكەی فەوتاوە. بەڵام ئەوەی گرینگە ناوەڕۆكی كتێبەكەی سون تزووە هەرچەندە ئەو ڕاو بۆچونانە بونیان هەیە بەڵام لەنرخ و بەهای كتێبەكەی سونی مەزن كەم ناكەنەوە.

٢٠١٥/٢/١٨

دەڤەری باڵەكایەتی

گوندی سولی — ناحیەی وەرتێ

# بەشی یەکەم

## نەخشەدانان

١-سون تزو وتویەتی: هونەری شەڕێ گرینگییەکی زۆری بۆ دەوڵەت هەیە.

٢-هونەری شەڕێ بابەتی مان و مردنە[1]، ڕێگایەکە بۆ ئاسودەیی یان بۆ وێرانی هەر بۆیە ئەو بابەتە ئەوە دەهێنێ کە ڕاڤە و گەنگەشەی بکرێت بە هیچ شێوەیەك ناکرێت، پشت گوێ بخرێ.

٣- پێنچ هۆکاری چەسپاو هونەری شەڕێ بەڕێوە دەبەن کە پێویستە لە بەر چاوبگیرێن (بەبایەخەوە لێ ی بڕوانرێ) بۆ ئەو کەسەی دەیەوێت ئەنجامی شەڕەکە لە گۆڕەپانی شەڕدا بۆخۆی یەکلا بکاتەوە.

٤-ئەو پێنچ هۆکارەش بریتیین لە:

١- بنەمای ڕەوشتی(تاو: Tao )

٢- ئاسمان (ئاو و هەوا)

٣- زەوی

٤- سەرکردە (فەرماندە)

## ٥- پەیڕەوە گشتییەکان

٦+٥ -بنەمای ڕەوشتی دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەڵکی (ژێر دەستە) بەتەواوی لەگەڵ فەرمانڕەوا ڕێك بکەون. لەبەر ئەوەی خەڵکی شوێن فەرمانڕەوا خۆیان دەکەون بێ ئەوەی گوێ بە خۆیان بدەن و لەمەترسی سڵ بکەنەوە.

٧- ئاسمان ئاماژەیە بۆ شەو و ڕۆژ ، ساردی و گەرمی، کاتەکان و چوار وەرزەکان .

٨-زەوی ئەمانەدەگرێتەوە: ماوەی دوور و نزیکی، مەترسی و ئاسایش و زەوی تەخت (دەشتایی) و ڕێچکەی تەنگەبەر ، ئەگەری ژیان و مردن .

٩-دەبێت سەرکردە نمونەی ژیری ، ڕاستگۆیی، چاکەکاری، ئازایەتی و وردەکاری بێت.

١٠-مەبەستمان لە پەیڕەوە گشتیەکان شێوازی ڕێکخستنی سوپا و دابەشکردنی سوپایە بەسەر یەکەکاندا بە شێوەیەکی دروست، چۆنییەتی دابەشکردنی پایە سەربازییەکان لە نێوان ئەفسەراندا، چاکسازی لەو ڕێگایانەی کە یارمەتی لێیانەوە دەگاتە سوپاکە. زاڵبون (کۆنترۆڵکردنی) بەسەر بڕی تێچووە سەربازییەکاندا.

١١– لەسەر هەموو سەرکردەیەك پێویستە کە بەتەواوی ئەو پێنج هۆکارە بزانێت ئەو کەسەی ئەو هۆکارانە بزانێت سەرکەوتوو دەبێت، ئەوەی نەیانزانێت شکست دەهێنێت.

١٢– هەر بۆیە لە هەموو ڕاپرسینێکت کە دەتەوێت بڕیار لەسەر بارودۆخی(دوو سوپا) بدەی با ئەم هۆکارانەی خوارەوە ببنە بناغەی لێکدانەوە و بەراوردەکەت :

١٣–

– کام لە فەرماندەی دوو لایەنەکە زیاتر پەیڕەوی بنەما ڕەوشتییەکان دەکات؟

– کام لە سەرکردەکان زیاتر توانای هەیە؟

– هۆکارەکانی ئاسمان و زەوی لە سودی کامە لایەنە؟

– کام لایەن بەتەواوی پابەندی بنەما گشتیەکانە؟

– کام سوپا بەهێزترە؟

– ئەفسەران وسەربازانی کام سوپا زیاتر ئامادەییان هەیە و ڕاهێنراون؟

– لە کامە سوپا زیاتر باوەڕ بە سزا و پاداشت بونی هەیە؟

١٤- لەکاتی بوونی ئەنجامی ئەو حەوت پرسیارە دەتوانم پێشبینی ئەوە بکەم کامە لایەن سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت و کامە لایەن شکست دێنێ.

١٥- ئەو فەرماندەی گوێ بە حیکمەت و ڕاوێژی من دەدات و کاری پێدەکات سەردەکەوێت دەبا ئەو جۆرە کەسانە (فەرماندانە) هەربەردەوام بن لەشەڕ. ئەو فەرماندەی گوێ بە حیکمەت و ڕاوێژی من نادات و کاریان پێناکات ئازاری شکست دەچێژێ. دەلێگەڕێ کەسی ئاوا با دەربکرێ.



١٦- لەو کاتەی سودمەندبوویت لە ڕاوێژی من ، کەڵك لە هەموو بارودۆخێکی شیاو و گونجاو وەربگرە تەنانەت ئەگەر بەزاندنی سنوری یاسا ئاساییەکانیش بێت.

١٧- (لەسەر فەرماندە پێویستە) بە گوێرەی ئەو بارودۆخە لەبارەی کە دێتە پێشەوە نەخشە و پلانی خۆی بگۆڕێت.

١٨- بناغەی شەڕوشۆڕ لەسەر فێڵ و تەڵەکە داندراوە.

١٩- لەبەرئەوە لەوکاتەی کە دەتوانین هێرش بکەین دەبێت وا خۆ دەربخەین کە ناتوانین هێرش بکەین. وە لەو کاتەی کە دەتوانین هێزەکانمان بجوڵێنین پێویستە وا پیشانی دوژمنی بدەین کە سست و خاوین (تەمای شەڕمان نییە) کاتێك لە دوژمن نزیك بوینەوە پێوستە وایان لێ بکەین کە گومان ببەن ئێمە لێیانەوە دوورین. کاتێکیش لێیانەوە دووربوین پێویستە وا لە دوژمن بکەین وابزانێت لێیانەو نزیکین.

٢٠- لە فریودانی دوژمن بەردەوام بە تاوەکو هەڵیدەخەڵەتێنی بەقەستی ئاژاوە و نارێکی لەنێو سوپاکەت پیشان بدە پاشان دوژمنەکەت (بگرە) و بیپلیشێنەوە .

٢١-ئەگەر دوژمنەکەت لە هەموو لایەنێکەوە دڵنیا و قایم بوو، خۆتی بۆ ئامادە بکە. ئەگەر دوژمن بالا دەستتر بوو خۆتی لێ لادە.

٢٢- ئەگەر سەرگەرم و تورە بوو، وەڕس و جاڕسی بکە[٢]. لاوازی و بێ هێزی خۆت نیشان بدە تاوەکو زێدەتر لە خۆبایی و لوت بەرز بێت.

٢٣- ئەگەر دوژمن لە ئاسودەیی وحەسانەوە دابوو بواری مەدە. ئەگەر هێزەکانی دوژمن یەکگرتوو بوون بڵاوەیان پێبکە.

٢٤- لەو شوێنەدا هێرش بکە کە دوژمن ئامادە نییە، لەو شوێنەدا بۆی بڕۆ کە ئەو هەر بەخەیاڵیشدا نەییَت کە تۆ لە وێیت.

٢٥- ئەو هۆیە سەربازیانەی تۆ بەرەو سەرکەوتن دەبەن هەر زوو ئاشکرایان مەکە.

٢٦- هەر ئەو فەرماندەیە لەشەڕدا سەرکەوتوو دەبێت کە لە پێش ڕوودانی شەڕەکە نەخشە و پلانی زۆری هەبێت. ئەو فەرماندەیە لەشەڕدا دەدۆڕێت کە لە پێشدا نەخشە و پلانی کەمی بۆ شەڕەکە هەبێت. کەواتە نەخشە و پلانی زۆر تۆ بەرەو سەرکەوتن دەبەن، نەخشە و پلانی کەمیش بەرەو دۆرانت دەبەن، ئاخۆ توشی چ دۆڕانێك دەبیٚ ئەگەر هەر هیچ نەخشەیەکت نەبێت. ئێستا کە سەرنج دەدەم، دەتوانم پێشبینی بکەم کە کێ ئەگەری بردنەوەی هەیە و کێش ئەگەری دۆڕانی هەیە.

## کورتەی بێژە لە بەشی یەکەم:

١-هونەری شەڕ پێنج بەردی بناغەی هەیە ئەمانیش: بنەمای ڕەوشتی، ئاو و هەوا، زەوی (ڕووبەر و دووری )، سەرکردە، پەیڕە و یاسا

٢- کوڵەگەی شەڕ بریتییە لە فێڵ و بەلاڕێدا بردن.

٣- ئەگەر لە هەر بارودۆخێکدا بویت ئەوا ڕاستی و دروستی خۆت نیشانی دوژمن مەدە.

٤- بەر لە شەڕ هەلومەرجەکە بخەملێنە و هەڵسەنگاندنی تێر و تەسەلی بۆ بکە .

٥- ڕەفتارت لەگەڵ دوژمن پێچەوانە و بەرەواژ بێت.

## پەراوێزەکان:

١) لی چوان دەلێت :چەك ئامێری بەد بەختییە. شەڕیش وەکو گوڕ وایە.

٢) وا باشە سەرلەشکری سوپای دوژمن زۆر تورە بکەین هەتا ئەو ڕادەی کە بەبێ پلان و بیرکردنەوە هێرشمان بکەنە سەر. کە دوژمن بە بێ پلان هێرشی کرد وەکو پاروێکی ئاسان و چەوری لێدێت بۆ گەروو.

# بەشی دووەم

## شەڕ بەرپاکردن

١- سون تزو وتویەتی: لەکاتی شەڕدا ئەگەر لەبەرەی شەڕ هەزار گالیسکەی جەنگی خێرا هەبێت، بەهەمان شێوە هەزار گالیسکەی قورس هەبێت و سەدهەزار سەربازی پیادەی زرێدار هەبێت، لەگەڵ ئازوخەی تەواو بۆ بڕینی ڕێی هەزار میل، هەروەها خەرجی ماڵەوە و شەڕ بە میوانداری و شتە بچووکەکانەوە وەکو کەتیرە و بۆیە، کە کۆی خەرجی گالیسکەکان و قەڵغانەکان و هەموو ئەوانەی تریش دەکاتە هەزار ئۆنسە زیو لە ڕۆژێکدا. ئەو برە خەرجییە سەرو زیادە بۆ ئامادەکردنی سوپایەکی سەد هەزار کەسی[1].



٢-ئەگەر بەڕاستی کەوتیتە شەڕ و سەرکەوتن دوا بکەوێت و زەحمەت بێت، چەکی سەربازان کول و خراپ دەبێت و هەروەها جۆش و خرۆشی سەربازان خامۆش دەبێت، ئەگەر ئابلۆقەی شارۆچکەیەکیش بدەی ئەوا بەبەلاش هێزەکەی خۆت ماندوودەکەی(٢) .

٣- دیسان ئەگەر هێرش و پەلامار درێژەی کێشا، دەوڵەت ناتوانێ خەرجی ئەو شەڕە هەلگرێ.

٤- ئینجا کە چەکەکانت کول بوون، جۆش و خرۆش دامرکایەوە،هێزەکەت نەما و گەنجینەکەت خەرج کرد. فەرماندەکانی تری دەوروبەر ئەم هەلە دەقۆزنەوە و دەتوانن سود لەو زیادەڕەوییەت وەربگرن. بەم شێوەیە هیچ کەسێك هەر چەند زۆر ژیریش بێت ناتوانێت خۆی لەو ئاکامە بەدوور بگرێ .

٥-بەم شێوەیە، ئەگەرچی پەلەپەل و تاودانی گەوجانە لەشەڕدا دەبینیت، بەڵام هەرگیز زیرەکی لەوەدا نییە کە شەڕ دوابخرێت.

٦- نموونەی هیچ وڵاتێکمان نییە کە سودمەندبوبێت لە درێژەدان بەشەڕو ناکۆکی .

٧- بۆیە ئەو سەرکردانەی کە لە زیانەکانی شەڕبەرپاکردن حاڵی نابن، ناتوانن لە سودەکانیشی تێبگەن.

٨- سەربازی شارەزا نە چاوەڕوانی هاتنی سەربازی زیاتر دەکات نە لە دوو جار زێتر گالیسکەی ئازوخەکەی بۆ باردەکرێتەوە.

٩- کەلوپەلی خۆت لەگەڵ خۆتدا بۆ شەڕ بهێنە، بەلاَم خواردەمەنی لە دوژمن بستێنە، بەمجۆرە سوپاکەت بە پێی پێویستی خۆی خواردەمەنی تەواوی دەبێت.

١٠- بەتاڵبوونی خەزێنە، دەوڵەت ناچار دەکات ئازوخە لە دەرەوەی ولاَت و شوێنی دوورەدەست هاوردە بکات. کۆکردنەوەی ئازوخەی سوپا لە شوێنە دوورەکان دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەڵکی بێ دەرامەت بن و هێزیان لەبەر ببڕێ [٣].

١١ـ لەلایەکی تریشەوە نزیکبوونەوەی هەر سوپایەك دەبێتە هۆی ئەوەی کە نرخی کەلوپەل بەرزبێتەوە، بەرزبوونەوەی نرخی کالاَکانیش دەبێتە هۆی ئەوەی سامانی خەڵکەکە هیچی نەمێنێ و بکەونە سەر ساجی عەلی .

١٢- لەکاتی نەمانی سامانی میللەت جوتیار و وەرزێران دەکەونە ژێر باری ناخۆشی و نەهامەتییەوە بەهۆی ئەو باج و سەرانە زۆرەی کە لێیان دەسەندرێ .

١٣+١٤- هەر لەگەڵ کەمبوونەوەی دەسمایەی خەڵك و لە کورتی دانی هێز، ماڵی خەڵکی دەبێتە ئاشی ئاو لێبڕاو. هەروەها سێ لە دەی دەستکەوتی خەڵکی بە فیڕۆ دەڕوا، لەو کاتەی مەسرەفی

حکومەت زیاتر دەبێت بۆ چاککردنەوەی: گالیسکە شکاوەکان و ئەسپەکفت و هیلاکەکان، زریّ و خودەکان ( کلاّوی ئاسنی سەربان)، تیرو کەوانەکان، ڕم و قەڵغانەکان، پۆشاکی جەنگی، گای بن باری و گالیسکەی قورس و زل ئەو مەسروفە دەکاتە چوار لەدەی داهاتی گشتی دەوڵەوت.

١٥- کەوابوو سەرکردەی شارەزاو ژیر سەرچاوەی خواردەمەنی سوپاکەشی لە دوژمنەوە پەیدا دەکات. چونکە یەك گالیسکەی ئازوخەی دوژمن یەکسانە بەبیست گالیسکەی خۆت[٤]. بەهەمان شێوە یەك پیکلّ [٥] لە پیتاکی دوژمن یەکسانە بەبیست پیکلّ لە کۆگەی خۆت .

١٦- ئا لەو کاتەی دەمانەوێت دەست بەشەڕ بکەین لەگەڵ دوژمندا، دەبێت سەربازانی خۆمان بخرۆشێنین و سەر گەرمیان بکەین بەوەی ئەگەر دوژمن شکا ئەوان (سەربازان) سودمەند دەبن و قازانج دەکەن، بەخشش و دەستکەوتی خۆیان وەردەگرن .

١٧- هەر بۆیە ئەگەر لەشەڕدا دە گالیسکە یان زیاتر دەستیان بەسەردا گیرا پێویستە پاداشتی ئەو کەسە بکریّ کە دەستی بەسەر یەکەمین گالیسکەدا گرتوە. پێویستە ئالأکانی خۆمان لە جیاتی ئالأی دوژمن لەسەر ئەو گالیسکانە دا هەڵبدەین. ئەو گالیسکانەشی تێکەڵ بە گالیسکەکانی خۆمان بکەین و لە شەڕیشدا بەکاریان

بهێنین. پێویسته بەنەرم و نیانی ڕەفتار لەگەڵ دیلەکان بکەین و بیانپارێزین .

١٨- بەو کارە دەوترێت بەکارهێنانی دوژمنی بەزیوو بۆ بەهێزکردنی خۆمان .

١٩- بۆیە با لەشەڕدا تاکە ئامانجت بریتی بێت لە سەرکەوتن، نەك درێژەدان بەپەلامار و هێرش.

٢٠- ئەوها زانراوە کەسەرکردەی سوپا بەرپرسە لە(مامەڵەکردن بە)چارەنوسی میللەت. هەر ئەو سەرکردەیەش بەرپرسە لەوەی کە ئاخۆ میللەت لە ئاشتی و ئاسایی دایە یان لەمەترسی.

## مشتێ لە خەرواڵێ :

١- جەنگ مەسروفێکی زۆری دەوێت، هەر بۆیە لە بەرێدا حیسابی تەواوی بۆ بکە، ئاخۆ خەزێنەی دەوڵەت و گیرفانی خەڵکی دەتوانن باری ئەو شەڕە هەڵبگرن ؟

٢- درێژە دان بە شەڕ و بەربەرەکانێ زیانێکی ئێجگار زۆری هەیە. بەس سەرکردەی بەئەزمون و لێهاتوو دەتوانێ زیانی شەڕ و گەمارۆ بخەملێنێت.

٣- هاندانی سەرباز ڕۆڵی چاکی هەیە بۆ سەرکەوتن.

**پەراوێزەکان:**

١) نوسەر لەم بەندە مەبەستی ئەوەیە: دەبێت بەرپرسان بڕی تێچوی شەڕەکە بزانن بەر لە چەخماخەی شەڕ. ئەگەر خەرجی شەڕەکە یەکجار زۆر بوو دەبێ حیسابێ بۆ خۆیان بکەن

٢) سەرکەوتن تاکە بابەتی گرینگی شەڕە جا ئەگەر کەوتە زاری شێر و شەڕەکە درێژەی کێشا ئەوا سەرباز تاقەتی نامێنێت و خەزێنەی وڵاتیش فلسی تێدا نامێنێت.

٣) ڕاستیەك هەیە ملەجیرەی لێ ناکرێت ئەویش ئەوەیە جەنگ لە هەر شوێنێك پەیدا ببێت نرخی هەموو شتێك گران دەبێت. هەروەها بەهۆی بڵاو بونەوەی ترس و شەڕ و کوشتار بازرگانی سست دەبێت و هاتوچۆی نێوان شار و وڵاتان ئەستەم دەبیت دواجار هەموو کڕین و فرۆشتنێك کز و لاواز دەبێت .

٤) چونکە تاوەکو یەك گالیسکەی خۆت دەگەیەنیتە بەرەی شەڕ باری بیست گالیسکەی دەوێت

٥) پیکلPICULکێشانەیەکی چینییە یەکسانە بە ٦٥کگم .



وێنەی شەڕ لە سەردەمانی کۆن لە وڵاتی چین



وێنەی شەڕێکی سەخت لە سەردەمانی زوودا

## بەشی سێیەم

## هێرش بردن بە فێڵەوە

١- سون تزو وتویەتی: لە باشترین بنچینە کردارییەکانی شەڕ ئەوەیە سەر لە بەری ولآتی دوژمن داگیر بکەی و دەستی بەسەردا بگری بە بێ کاولکاری چونکە تەخت کردن و تێك و پێکدانی شار کارێکی باش نییە. هەروەها وا باشترە هەموو سوپای دوژمن بە دیل بگری نەوەك تاکوجوتیان لێ ببری. دەستگیرکردنی دەستەیەك ( فەوجێك)، تیپێك یا خود پەلێك (لە سوپا) بەگشتی زۆر باشترە لە کوشتنی هەموویان.

٢- شەڕکردن و سەرکەوتن لە هەموو شەڕەکانتدا نایابترین دەستکەوت نییە. بەڵکو نایابترین دەستکەوت ئەوەیە بەرهەڵستی دوژمن تێکبشکێنی بەبێ شەڕ و بەربەرەکانێ .

٣- باشترین کاری ئەفسەری سوپا ئەوەیە نەخشەو پلانی دوژمن پوچەڵ بکاتەوە. دووەمین کاری باش ئەوەیە کە نەهێڵێت هێزی دوژمن بەیەك بگەن، ئەوجا لە مەیدانی شەڕ پەلاماری سوپای دوژمن بدات. خراپترین ڕەفتاریش ئەوەیە گەمارۆی شاری شورەدار بدەی.

٤- بە پێی پەیڕەوی سەربازی، نابێت ئابلوقەی شاری شورەدار بدەیت ئەگەر بکرێ خۆتی لێ تەریك بکەی. چونکە ئامادەکردنی زرێداری گەورە و سەنگەری ڕاگوێزراو و ئەو هەموو کەلوپەلەی شەڕ سێ مانگی تەواوی دەوێت. هەروەها دروستکردنی تەپۆلکە بۆ ئەوەی تۆپ هاوێژ(مەنجەنیق)ی لەسەر دابنێی لەبەرامبەر شورەکاندا سێ مانگی تری دەوێ.

٥- ئەفسەری سوپا کە نەتوانێ بەسەر تورەیی و ئاگری دڵی خۆی زاڵ بێت لەخۆڕا فرمان بەسەربازەکانی دەکات کە وەکو شارە مێرووڵەیەك هێرش بکەن، لەئەنجامدا یەك لە سێی سەربازەکانی دەکوژرێن و لە کاتێکدا هێشتا شارۆچکەکە دەستی بەسەردا نەگیراوە. ئەو بەد ئەنجامیەش بەهۆی ئابلوقەدانەوەیە .

٦- فەرماندەی کارامە، لەشکری دوژمن بە بێ هیچ شەڕێك دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆی. بێ ئەوەی گەمارۆی شارەکان بدات شارەکانیان لێ داگیر دەکات. تەخت و تاراجی دوژمن دەروخێنێت بێ ئەوەی لە مەیدانی شەڕ زۆر بمێنێتەوە .

٧- فەرماندەی کارامە دەتوانێت بەخۆی و بەسوپاکەیەوە بە ساغ وسەلامەتی بگەڕێنەوە و ئیمپراتۆری دوژمن لە سەر تەخت

بهێننه خوارەوه، به بێئەوەی خوێنی سەربازێك برژێت ئینجا به سەرکەوتنی ئەو سەرکردەیه دەوترێت ئەو پەڕی تەواوی. ئا ئەمه شێوازی پەلەماردانی فێڵبازانەیه .

٨- ڕێسای شەڕ ئەوەیه، ئەگەر هێزی سوپای تۆ ده بەرامبەر یەکی هێزی دوژمن بوو، ئەوا دەبێت گەمارۆی دوژمنەکەت بدەیت، ئەگەر هێزی سوپاییت پێنج به یەك بوو دەبێت پەلاماریان بدەیت. ئەگەر له ژمارەدا دوو هێندەی ئەوان بوویت سوپاکەی خۆت بکه به دوو بەش .

٩- ئەگەر بەقەد یەکتر بوون و تەن بەتەن بوو دەتوانین بۆیان بچینه مەیدان، ئەگەر ژمارەی ئێمه برێك کەمتر بوو دەکرێ خۆ له دوژمن به دوور بگرین، ئەگەر به هەموو بارێك نایەکسان بووین، چار نییه دەبێت خۆمان دەرباز بکەین و هەڵێین .

١٠- لەم سونگەیەوه، هەرچەند سوپایەکی بچوك دەتوانێ شەڕێکی قورس و سەخت (لەگەڵ سوپایەکی گەورەدا) بکا، وەلێ له کۆتاییدا هەر دەبێت لەلایەن سوپا گەورەکەوه بەدیل بگیرێ .

١١- سەرکردەی سوپا کەلاتی(قەلا) دەولەکەیەتی، ئەگەر کەلایەکه لەهەموو لایەنێکەوه تۆکمه و تەواو بوو مانای وایه ئەو

دەوڵەتە بەهێز و خۆڕاگرە. بەڵام ئەگەر کەلاکە کەم وکورتی هەبو ئەوا دەوڵەتەکەش بێ هێزو لاواز دەبێت.

١٢- لە سێ ڕێگاوە فەرماندە، سوپاکەی خۆی توشی بەدبەختی دەکات.

١٣-(١) فەرمانکردن بە سوپا(لە لایەن فەرماندەوە) بۆ پێشڕەوی یان کشانەوە بێ ئەوەی ئاگای لەو ڕاستییە بێت کە سوپاکەی ناتوانێ ئەو کارە بکات. بەوە دەگوترێت پەکخستنی سوپا .

١٤-( ٢) سەرکردایەتی کردنی سوپا بەو شێوەی کە پادشایان وڵات بەڕێوە دەبەن، بێئاگاش لەوەی کە ئەم جۆرە ڕەفتارە دەبێتە هۆی ئەوەی بیرو مێشکی سەربازان توشی بێزاری و ناڕەحەتی بێت.

١٥-(٣) دانانی ئەفسەر بۆ سوپاکەی بێ هیچ جیاکارییەك ئەمەش لە ئەنجامی بێ ئاگایی لەو ڕێسا سەربازییانەی کە پەیوەستن بە خۆ گونجاندن لەگەڵ هەلومەرجەکان. ئەمەش وا لەسەربازەکان دەکات کە متمانەیان بە سەرکردەکەیان کەم بێتەوە .

١٦- لەو کاتەی سوپا توشی بێزاری و بەد گومانی دەبێت فیتنە و ئاشوب لە لایەن ڕژێمی میرەکانی ترەوە بەسەر ئەو سوپایە دادەبارێت. بەم جۆرە هەر بە ئاسانی پاشاگەردانی و پشێوی دێتە ناو سوپایەکە و سەرکەوتنیش بە چاوی خۆمان نابینین.

١٧- هەروەکو دەزانین کەپێنج بنەما بۆ سەرکەوتن هەیە ؟

١) ئەو کەسە سەردەکەوێت کە بزانێت کەی شەڕ دەکات و کەی شەڕ ناکات.

٢) ئەو کەسە سەردەکەوێت کە بزانێت چۆن ڕەفتار لەگەڵ سوپای زلهێز و سوپای بچوك دەکات.

٣) ئەو کەسە سەردەکەوێت کە هەموو جومگەکانی سوپایەکەی هەمان جۆش و خرۆشیان هەبێت.

٤)ئەو کەسە سەردەکەوێت کە خۆی ئامادە کردبێت و خۆی دانوساندبێت تاوەکو لەپڕدا بەسەر دوژمندا بدا کە هێشتا دوژمن ئامادەیی نییە .

٥) ئەو کەسە سەردەکەوێت کە دەسەڵاتی سەربازی خۆی هەبێت و پاشا (ی وڵات) ڕێگەی لێنەگرێت (و دەست لەکاروباری ئەو سەرکردەیە وەرنەدات) .



١٨- وتەیەکی نەستەق هەیە دەڵێت : ئەگەر خۆت و دوژمنەکەت ناسی پێویست ناکات لە ئەنجامی سەد شەڕیش بترسی. ئەگەر خۆتت ناسی بەڵام دوژمنەکەت نەناسی لە هەمو سەرکەوتنێك کە وەدەستی دەخەیت لەوانەیە توشی شکستیش ببیتەوە. ئەگەر خۆت و دوژمنەکەتت نەناسی ئەوا لەهەمو شەڕێکدا ( هەرەس دەهێنیت ) خۆ بەدەستەوە دەدەیت.

## کاکڵی بەشی سێیەم:

بە گوێرەی ڕاوبۆچونی هەندێ لە شرۆڤەکارانی ئەم پەرتوکە ئەم بەشە گرینگترین و نایابترین بەشە چونکە باسی بڕبڕەی سەرکەوتن کراوە  کە دەڵێت (بە بێ شەڕ شکست بە دوژمن بهێنە)جا لەژێر ڕۆشنایی ئەم وتە جوان و مرۆڤانەیە ئەم خاڵانەباس دەکەین:

١–سەربازی زیرەك بەبێ هیچ گەمارۆدان و شەڕێك دەتوانێت بەسەر دوژمن زاڵ بێت.

٢–سەرکردەی سوپا پشت و پەنای حکومەتی ئەو وڵاتەیە.

٣–سێ بەڵا هەن کە نابێت سەرلەشکر لێیان نزیك ببێتەوە (بەندی ١٣ _ ١٤_١٥).

٤–پێنج بنەمای بنجی بۆ سەرکەوتن هەیە(خاڵەکانی بەندی ١٧)



# بەشی چوارەم

## پێچ و پەنای سەربازی

١- سون تزو وتویەتی: جەنگاوەرە چاکەکانی پێشان سەرەتا خۆیان لە شکست بە دووور دەگرت دواتر چاوەڕوانی هەلێکیان دەکرد تاوەکو دوژمن شکستپێبهێنن.




٢- پاراستن و سەلامەتی خۆمان لە شکست و هەرەس لە بە دەستی خۆمانە. بەڵام دەرفەتی شکاندنی دوژمن، دوژمن هەر خۆی دەیڕەخسێنێ.

٣- جەنگاوەری خاس و لێهاتوو ئەوەیە کە بتوانێ خۆی لە بەزین بپارێزێ، بەلاّم ناتوانێ لەوە دلّنیا بێت کە هەمیشە ئەگەری شکاندی دوژمن لە گۆڕێدایە.

٤- وتەیەك هەیە دەڵێت: لەوانەیە کەسی وا هەبێت کە بزانێت چۆن سەرکەوتوو دەبێت بەلاّم نەتوانێ (بەکردار ) جێبەجێی بکات .

٥- مانەوە بە سەلامەتی لە بەرگریکردنە، ئەگەری سەرکەوتنیش لە هێرشبردن دایە.

٦- ئەگەر تەنها لەبەرەی بەرگری بوەستی مانای وایە هێزێکی کەمت هەیە. بەلاّم ئەگەر هێرش بکەی واتە هێزێکی زۆرت هەیە.

٧- سەرکردەی لێهاتو ئەوکەسەیە لەبەرگری کردندا خۆی لە بن حەوت چینی زەوی حەشاربدات[1] سەرکردەی شارەزا ئەوەیە کە لە کاتی هێرش بردندا وەکو بروسك وابێت کەلەو پەڕی ئاسمانەوە دێت و خۆ دەنوێنێت. بەم جۆرە لەلایەکەوە دەتوانین خۆمان بپارێزین ، لەلایەکی ترەوە دەتوانین سەرکەوتنێکی تەواو بەدەست بهێنین.

٨- ئەو سەرکردەیەی کە وەکو ڕەشە خەڵکەکە[2] هەر ئەو کاتە سەرکەوتن ببینێ کە بەدی هاتووە، شتێکی باش نییە .

٩- بەرزترین پلەی دانایی ئەوە نییە کە تۆ شەڕ بکەیت و سەرکەوتن وەدەست بهێنیت و هەموو خەڵکی وڵات پێت بڵێن "ئەی ئافەرین، دەست خۆش" .

١٠- هێزێکی زۆر نیشانەی ئەوە نییە کە تۆ موو لە ماست دەربێنی بێ ئەوەی بشلەقێ [٣] هەروەکو چۆن بینینی خۆر و مانگ نیشانەی چاوتیژی نین. گوێبیست بوونی هەورە بروسکە نیشانەی گوێ سوکی نییە.

١١- لە دەوری پێشینان بەو سەرکردەیان دەگوت(جەنگاوەری چاك) کە نەك هەر براوە بوایە بەڵکو دەبوایە بە ئاسانی سەرکەوتوو بوایە و لە هەمووانیش چاکتر بوایە.

١٢- بۆیە سەرکەوتنەکانی جەنگاوەر نە ناوبانگی ژیری و نە ستایشی ئازایەتی بۆ پەیدا دەکەن.

١٣- جەنگاوەری چاك لەشەڕاندا بەوە دەیباتەوە کە هەڵە نەکات، مەبەست لە هەڵەنەکردن ئەوەیە کە جەنگاوەرەکە بەتەواوی دڵنیا بێت لە سەرکەوتنی خۆی، هەروەکو وتراوە زاڵبوون بەسەر دوژمن واتە بەتەواوی بیشکێنێ .

١٤- جەنگاوەری کارامە خۆی لەو شوێنە دەنێ کەشکست تێیدا مەحال بێت. هەرگیز دەرفەتی ژێرخستنی دوژمنیش لەدەست نادات.

١٥-لەشەڕدا سوپاسالاری لێهاتووی سەرکەوتوو ئەو کاتە دەچێتە شەڕ کە سەرکەوتن وەدەست هاتبێ، بەڵام لە کاتێکدا سەرکەوتن بە دەستنەهاتبێ، دەبێ سوپاسالار بە هیواوە بچێت بۆ شەڕ.

١٦-سەرکردەی بێ هاوتا و پلەیەك پەرەبە بنەما ڕەوشتییەکان[٤] دەدات و بەتەواوی پەیڕەوی لە بنەما گشتیەکان دەکات. هەر ئەو هۆکارانەش وا لەو سەرکردەیە دەکەن سەرکەوتوو بێت.

١٧ + ١٨- لە ڕوانگە سەربازیەکانیشەوە. هونەری شەڕ ئەو بنچینانەی هەیە :

١- پێوانە و ئەندازەگیری زەوی (بۆ خەملاندنی هێزی دوژمن)

٢- خەملاندنی چەندایەتی (لەبەرچاوگرتنی بارودۆخی دوژمن)

٣- لێکدانەوەی ژمارەکان (لێکدانەوە و زانینی ژمارەی هێزی دوژمن)

٤- بەراوردکاری و هاوسەنگی (زانیاری زانستیە بۆ ئەوەی بزانین هێزی ئێمە لە بەرامبەر هێزی دوژمن چەندە )

٥- ئەگەرەکانی سەرکەوتن (ئەنجامی بەراوردکارییە)

١٩- سوپای سەرکەوتوو بەبەراورد لەگەڵ سوپای دۆڕاو و بەزیو لە تای تەرازوودا وەك پاوەندێك[٥] وایە لەهەمبەر دەنکۆڵەیەکدا .

٢٠-تەوژم و هاژەی هێزی سوپای براوە وەکو دەرپەڕینی ئاوی پەنگخواردوە لە بەرزاییەوە کە بڕژێتە کەندەلانێکی ٦٠,٠٠٠پێ [٦] .

**دەکرێت بڵێین پوختە و کورتەی ئەم بەشە وەڵامی ئەم پرسیارانەی خوارەوەیە:**

١- چۆن سەرپەرشتی سوپا بکەین وە چی بکەین؟

٢- چۆن هێرش بکەین؟ چەند شێوازی هێرشکردن هەیە؟

٣- کەی سەرکەوتن مسۆگەر دەکەین؟

٤- سەرلەشکری زانا چۆن هێرش دەکات وە چ نەخشە ڕێگایەك بەکاردێنێت.

٥- بڕیاردان و هێرش کردن بەدوای یەکتردا دێن، لە چی دەچن؟

٦- چۆن دوژمنەکانمان چەواشە بکەین؟

٧- ڕواڵەتی و هەڵفرپیواندن چۆن دەکرێت؟

٨- کاریگەری یەکرپیزی سوپا چۆنە؟

## پەراوێزەکان:

١) لەدەقە چینییەکەدا دەڵێت : نۆ چینی زەوی لەوانەیە چینییە کۆنەکان بڕوایان وابێت کەزەوی لە نۆ چین پێکهاتووە .

٢) ڕەشە خەڵك: واتە خەڵکی ئاسایی ( کەسانێك شارەزاییان لە کاروبارێکی تایبەتی نەبێت . مەبەست لەم وتەیە ئەوەیە دەبێت سەرکردە زۆر پێش ڕوودانی شەڕەکە پێشبینی سەرکەوتن بکات.

٣) پەندی پێشینانی چینی دەڵێت: زلهێزی و زیرەکی مانای ئەوە نییە نەهێڵێت موێکی توکی کەروێشك لەوەرزی پایزدا بجوڵێت لە کوردیدا دەڵێت موی لە ماست دەربێنێ ناهێڵێ بشلەقێ .

٤) بۆ زانیاری دەربارەی ( ڕێسا ڕەوشتیەکان ) و ( بنەما گشتیەکان ) بڕوانە سەرەتای بەشی یەکەم .

٥) پاوەند کێشانەیەکە ، بریتیە لە شازدە ئۆنس ، نەختێك لە نیو کیلۆ کەمترە.

٦) لەدەقە ڕەسەنەکەدا دەڵێت هەزار فاسۆم هەر فاسۆمێك (fathom) یەکسانە بە ٦ پێ. fathom بۆ پێوانی قولایی بەکاردێت.

# بەشی پێنجەم

## هێز و توانا

١-سون تزو وتویەتی: شێوازی سەرپەرشتی و کۆنترۆڵی زلە سوپایەك بەهەمان شێوەی کۆنترۆڵکردنی دەستەیەکە (مەفرەزەیەك) کە لە چەند سەربازێك پێکهاتبێ. تەنها پرسی گرینگ ئەوەیە کە چۆن ئەو ژمارەیە دابەش بکەیت: بۆ یەکە، دەستە، پەل، هتد...

٢-شەڕکردن لەگەڵ سوپایەکی گەورە لەژێر سەرکردایەتی تۆدا هیچ جیاوازیەکی وای نییە لەگەڵ شەڕکردن لەگەڵ سوپایەکی بچوك. مەسەلەکە دیاریکردنی شوێن و فەرمان دەرکردنە[1].

٣-بۆ دڵنیابون لەوەی کە سوپایەکەت دەتوانێ بەرگەی پەلاماری دوژمن بگرێ و خۆی ڕادەگرێت، دەبێت فرت و فێڵی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ[2] تێکەڵ بکەیت تاکو سەر لەدوژمن بشێوێنی و دەستخەڕۆی بکەیت.

٤-پێویستە کاریگەری سوپاکەت وەکو بەردەئاشێك وابێت کە بە هێلکەیەکی دادەدەیت. ئەم جۆرە هێزە کاریگەرە بەزانینی خاڵە لاواز و بەهێزەکانی هەردوولا دەست دەکەوێت[3].

٥- لە هەموو شەڕێکدا نەخشە ڕێگای ڕاستەوخۆ تا دەستەویەخەبونی شەڕ بەکاردێت دواتر نەخشە ڕێگای ناڕاستەوخۆ بەکاردەهێنین بۆ ئەوەی سەرکەوتن مسۆگەر بکەین.

٦- جێبەجێکردنی تاکتیکی ناڕاستەوخۆ سنوری بۆ نییە هەر ڕێك وەکو ئاسمان و زەوی کە هەرگیز تەواو نابن. تاکتیکی ناڕاستەوخۆ بێ کۆتاییە وەکو ڕۆیشتنی ئاوی ڕووبار و جۆگەڵە، وەکو خۆر و مانگ وایە ئاوا دەبن بۆ ئەوەی لە نوێوە سەر هەڵبدەنەوە وەکو چوار وەرزەکان دواییان دێت تاوەکو جارێکی تر بگەڕێنەوە .

٧- خۆی لە خۆیدا ئێمە لەپێنج نەوای موزیکی زیاترمان نییە بەڵام لە ئەنجامی تێکەڵکردنی ئەو پێنج نەوایە ئەوەندەمان ئاواز دەست دەکەوێ کە گوێ دەرۆستی بیستنی هەموان نایەت.

٨-خۆ لە پێنج ڕەنگی بنچینەیی[٤] پترمان نییە. بەڵام لە تێکەڵکردنی ئەو پێنج ڕەنگە، ئەوەندەمان ڕەنگ بۆ دێتە بەرهەم کە چاو بە بینینی هەمویان ڕاناگات.

٩-لە پێنج تامی سەرەکیش[٥] زێترمان نییە کەچی لە ئەنجامی ئاوێتەکردنی ئەو پێنج تامە دەتوانرێت ئەوەندە جۆر تاممان بۆ پەیدا بێت کە هەرگیز بە چێژ کردنی هەمویان ڕاناگەین[٦].

١٠-لە شەڕدا لە دوو نەخشە ڕێگا پترمان نییە بۆ هێرشکردن – هێرشکردنی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ–، کەچی لەئەنجامی تێکەڵاو

کردنی ئەو دوو نەخشە ڕێگایە زنجیرە پیلانی بێ شومار دێنە بەرهەم.

١١-هەریەکە لە نەخشە ڕێگای ڕاستەوخۆ و ناراستەوخۆ بۆ یەکتری هانمان دەدەن، وەکو خولانەوە لە ناو شێوە بازنەییەك کە هەرگیز ناگەیتە خاڵی کۆتایی. ئەوجا کێ دەتوانێ بگاتە خاڵی کۆتایی ئەو ئەگەرانەی کە لە تێکەڵکردنی ئەو دوو نەخشە ڕێگایە دێنە بەرهەم ؟

١٢-هێرشی سەربازان وەکو بەخوڕ ڕۆیشتنی لافاوە کە تەنانەت گاشە بەردیش لەڕێرەوی خۆی گلۆر دەکاتەوە.

١٣-بڕیاری چاك ، وەکو پەلاماری هەڵۆیەك وایە کە لەکاتی خۆیدا دەکرێتە سەر نێچیر و هەلا هەلای دەکات.



١٤- لەبەر ئەوە جەنگاوەری چاك زۆر پیس هێرش دەبات و لە بڕیاردانیش دواناکەوێت.

١٥- هێز و توانا بەو کەوانە دەچێت کە چەماوەتەوە تاوەکو تیر دەربپەڕێنێ، بڕیاریش بە ژێی دەستی تیرهاوێژ دەچێت (تا نیشانەکە بپێکێ).

١٦- لە میانەی هات و هاوار و ژاوە ژاوی شەڕێدا لەوانەیە ناڕێکی و پشێوی دەربکەوێت، بەس نەك ناڕێکییەکی بەڕاستی. لەوانەیە لەکاتی ئاژاوە و شڵەژاندا ڕێزەکانی سوپاکەت بێ سەروبەر بن کەچی دەبێت هەر خۆت بپارێزیت لە شکست و بەزین.

١٧- دەبێت لە مەرجی پێشەکیدا ڕێکوپێکی تەواوت هەبێت ئینجا بێ سەروبەری لە ( نێو سوپاکەی خۆت نیشان بدەی تا دوژمن لاڕێ بکەی، هەر یەکسەر دوای هێرشی دوژمن لەشکرەکە بگەڕێتەوە سەرباری ئاسایی خۆی) دەبێت ئازایەتیت هەبێت ئینجا بەڕواڵەت خۆت بە ترسنۆك دەربخەی. دەبێت تواناو هێزت هەبێت ئینجا خۆت بە لاواز بنوێنی.

١٨- دەبێت ڕێکو پێکی (ظبط) لە ژێر پەردەی بێ سەروبەری و ئاژاوە بشاریتەوە، ئەم کارەش مانای باش دابەشکردنی یەکەکانی سوپایە. دەرخستنی ترسنۆکی و شاردنەوەی ئازایەتی پێویستی بە

بونی هێزێکی شاردراوەی تەرخان هەیە. سوپاکەت بەفرت و فێڵ ڕێکبخە ( کە دوژمن) هێزی بەرگریت بەلاوازی ببینێت.

١٩- ئەو کەسەی لێهاتوو و کارامەیە لە یاریکردن بە دوژمن، لەسەری پێویستە بە شێوەیەك ڕواڵەتە تەڵەکەبازیەکەی خۆی بشارێتەوە (تا دوژمن بەلارێدا ببات و دەستخەرۆی بکات)، با قوربانییەك بدات تا دوژمن بکەوێتە داوەکە.

٢٠- دوژمن لە داوەکە بهێڵەوە، بە دڵی خۆت یاری پێبکە و بەسەربازە پاڵەوانەکانت بۆ (دوژمن) لە بۆسەدابەو چاوەڕوانیان بە.

٢١- سەرکردەی لێزان لە کاریگەری یەکڕیزی سوپا دەڕوانێت . چاوەڕوانییەکی وا زۆری لەتاکە سەربازێك نییە. بەم شێوازە دەتوانیت سەربازی شیاو هەڵبژێریت و سود لە یەکێتی هێزەکان وەربگریت.

٢٢- لەو کاتەی (سەرکردەکە) سودی لە یەکێتی هێزەکانی وەرگرت سەربازە شەڕکەرەکان وەکو گاشە بەرد یان کۆترە داری خلۆرکراویان لێدێت. هەر بەعادەتی خۆیان کۆترە دار و گاشە بەرد لە زەوی تەخت سەنگین و نەبزۆکن، بەڵام ئەگەر لە لێژی قەدپاڵان بن باکوت دەبن. (ئەگەر چوار لابن هەر زوو دەچەقن بەڵام ئەگەر خڕبن بە ئاسانی بانگلۆر دەبن.)

٢٣- ئەو هێزو توانایيەی کە جەنگاوەرە قارەمانەکان دەریدەخەن وەکو هێز و گوڕی خڕکە بەرد کە لەسەر پۆپی شاخێکەوە بکەوێتە خوارەوە کە هەزاران پێ بەرزبێت[٨] .

## دەستەبژێری بەشی پێنجەم:

١-دەبێت دەستی شەڕ لە سوپادا پۆڵاین بێت. هەرچەندە دوژمن بەهێز و سەرسەخت بێت سڵی لێ نەکاتەوە و هێزی دوژمن وەکو هەویر بشێلێت .

٢-دوو ڕێگامان هەیە بۆ هێرشبردن ئەوانیش:

ڕێگەی ڕاستەوخۆ: ڕێگەیەکی چاولێکەری (تقليدی) سەردەمانی کۆنە دوو سوپا ڕوو بە ڕوو لەیەکتر دەدەن.

ڕێگەی ناڕاستەوخۆ: فرت و فێڵ، لێرەدا زیرەکی سەرلەشکر بەدەردەکەوێت ئاخۆ ئەو سەرکردەیە تا چ ڕادەیەك دەتوانێت تاکتیکی نوێ و فێڵبازانە بەکاربهێنێت. لە هەردوو ڕێگە چاتر ئەوەیە هەردوو ڕێگەکە ئاوێتە بکەیت .

٣-ئەگەر سوپایەکی تۆکمە و ڕێکخراوت هەبوو وا پیشانی دوژمنی بدە کە سوپاکەت بێ سەر و بەرە .ئەگەر ئامادەی شەڕ بویت ئەوجا وا خۆت دەربخە کە ماندوو و سستی و تەمای پشوودانت هەیە، بەمە دەڵێن هونەر.

## پەراوێزەکان:

١)ئەم دێڕەی کۆتایی لە چاپە عەرەبیەکەی ئەکرەم موئمین دا نییە .

٢) فرت و فێڵ / موناوەرە (maneuver) دوو جۆری لێ باسکراوە:

أ. ئاسایی – ڕاستەوخۆ – هەموار ( الایجابیە) – شینج : direct : ئەو شێوانەن کە ناسراون و هێزە سەربازیەکان دەیانزانن و هیچ شتێکی تایبەتمەندی تێدا نییە، هەر لە ڕۆژی ڕوناك هێرش دەکەیت یاخود بەرگری دەکەیت.

ب. نا ئاسایی – ناڕاستەوخۆ – ناهەموار (السلبیە) تشی : indirect : شێوازێکە کە دوژمن پێشبینی نەکات و پێشتر بەکارنەهێنرابێت. بڵاوکردنەوەی هەواڵی چەواشەکاری و گەوجاندن بۆ سەرسام کردنی دوژمن بەشێکە لە فرت و فێڵی ناڕاستەوخۆ.

٣) هێزی خۆت ، هێزی دوژمن .

٤) پێنج ڕەنگە سەرەکیەکە بریتین لە: شین، زەرد، سور، سپی، ڕەش.

٥) تامە سەرەکیەکان بریتین لە : ترشی، تیژی، سوێری، شیرینی، تاڵ و تفتی

٦)سون تزو ئەم نمونانەی بە نەوا و ڕەنگ و تام هێناوەتەوە تاکو فرە جۆری شتەکانمان پیشان بدات پێش ئەوەی باسی چۆنییەتی تێکەڵکردنی دوو نەخشە ڕێگاکەی هێرشکردن بکات.

٧) جەنگاوەرە قارەمانەکان هەرچەندە ژمارەیان لە سوپادا کەم بێت بەڵام بۆی هەیە کە بەر ئەنجامی زۆر سەرکەوتوانە و گرینگ بەدەست بهێنن وەکو خڕکەی بچوك کە لە ترۆپکی شاخێك دەکەوێتە خوارەوە تەوژم و تینێکی زۆر مەزن پەیدا دەکات.

# بەشی شەشەم

## خاڵە لاوازەکان ، خاڵە بەهێزەکان

١-سون تزو وتویەتی: ئەو لایەنەی کە یەکەمجار دێتە شەڕگە و چاوەڕوانی هاتنی دوژمن دەکات، چوست و چالاکتر دەبێ. لایەنی دووەم کە دێتە مەیدانێ دەبێت پەلەپەل بکات، کە دەشگاتێ بە ماندوویی دەگاتێ.

٢-جەنگاوەری شارەزا ویستی خۆی بەسەر دوژمن دەسەپێنێت، بەڵام هەرگیز لێناگەرێ ویست و خواستی دوژمن بەسەر ئەودا بسەپێت.




٣- بە لەبەرچاوگرتنی سودی خۆی، (سەرلەشکری شارەزا) دەتوانێ هەر بەخۆی وا لە دوژمن بکات لێی نزیک ببێتەوە یاخود

بەگورز لێوەشاندن دەتوانێ وابکات  کە هەرگیز دوژمن نەتوانێ لەو نزیک ببێتەوە.

٤- ئەگەر دوژمن لەکاتی حەسانەوەیدا بوو (جەنگاوەری زیرەك، سەر لەشکری ژیر) دەبێت هەراسانی بکات. ئەگەر دوژمن تێروپڕ بوو دەشێ (ئەو سەر لەشکرە) وابکات دوژمن برسی ببێت. ئەگەر دوژمن بەئاسودەیی بارگەی لێخستبوو، سەر لەشکری ژیر دەتوانێت وا لە دوژمن بکات جێواری بگوازێتەوە و بجولێ.

٥- لەو شوێنانەدا خۆت بەدەر بخە کە دوژمن پەلەی بۆ دەکات تا بیپارێزێ. بەخێرایی بەرەو ئەو شوێنە برۆ کە هەرگیز پێشبینی نەکرێت تۆ لەوێ بیت.

٦- لەوانەیە سوپایەك ڕێگەیەکی دوورودرێژ بەبێ ناخۆشی و زەحمەتی تەی بکات بە مەرجێك بەشوێنێك دا بڕوات کە دوژمنی لێ نەبێت.

٧- دەشێ دڵنیابیت لە سەرکەوتن لەو هێرشانەی کە تەنیا دەیکەیتە سەر ئەو شوێنانەی کە نەپارێزراون (خاڵی بێهێزی دوژمنن). دەکرێت لە بەرگری و بەرهەڵستی خۆت دڵنیابیت ئەگەر لەهەموو ئەو شوێنانەش (لایەن) ئامادەبیت کە تەنانەت ئەگەری هێرش لێ کردنیان نییە[1].

٨-ئەو سەرکردەیە لێهاتوە لە هێرش بردن کە دوژمنەکەی نەزانێت (سەری لێتێکبچێ) کە بەرگری لە چ سەنگەرێکی توند بکات. ئەو سەرکردەیە لێهاتووە لە بەرگری، کە دوژمنەکەی نەزانێت هێرش بۆ چ سەنگەرێکی ببات.

٩-ئەگەر بە دزی و پارێزی بجولێین وامان لێدێت بە چاو نەبینرێین، خۆ ئەگەر بە کڕی و بێ دەنگی ئیشی خۆمان بکەین کەس بە هاتنمان نازانێت .لە پاشان (کە لە دوژمن نزیک بوینەوە) چارەنوسی دوژمن دەکەوێتە بن دەستی خۆمان .

١٠-ئەگەر تۆ خاڵی لاوازی دوژمن بە ئامانج بگری و لەوێوە پەلاماری بدەیت لەوانەیە بەشێوەیەك بەرەو پێش بچی (کە دوژمن) نەتوانێت بەربەرەکانێت بکات. ئەگەر جموجۆڵی تۆ لەهی دوژمن خێراتر بوو لەوانەیە لە ساتی پاشەکشەکردندا لە مەترسی گرتن و کوشتن دەرباز ببیت.

١١-ئەگەر ویستت شەڕ بکەیت، دەکرێ وا لە دوژمن بکەیت شەڕت لەگەڵدا بکات، تەنانەت ئەگەر خۆی لە پشت شورەی بەرز پەنا دابوو یان خۆی لەناو خەندەکی قوڵ داڵدە دابوو. ئەوەی لەسەر تۆ زۆر پێویستە بیکەیت ئەوەیە هێرش بکەیتە سەر ئەو شوێنانەی کە دوژمن ناچاربێت (لە پەناگەی خۆی بێتە دەرەوە تاکو) فریایان بکەوێت و بیانپارێزێت[٢] .

١٢-ئەگەر ویستت لەسەر شەڕ نەبوو(فێڵ لە دوژمن بکە ). دەتوانیت وا لە دوژمن بکەیت شەڕت لەگەڵدا نەکات. تەنانەت ڕێوشوێنی بنکەو سەنگەرەکانیشت لەسەر زەوی بەجێ مەهێڵە. ئەوەی کەلەسەر تۆ پێویستە بیکەیت ئەوەیە شتێکی هێندە نامۆ و نەزانراو ئاڕاستەی دوژمن بکەیت کەدوژمن بە لاڕێدا ببات.



١٣-بە ئاشکراکردنی نیاز و مەبەستی دوژمن لە کاتێکدا کە خۆمان بەشاردراوەی هێشتۆتەوە و لەبەر چاوان دوورین، دەتوانین هێزەکانی خۆمان کۆبکەینەوە لەکاتێکدا پێویستە درز و کەلێن لە نێو سوپای دوژمن دروست بکەین.

١٤- ئێمە دەتوانین سوپایەکی یەکگرتوو و یەك جەستە دروست بکەین لە کاتێکدا لەسەرمان پێویستە درز بخەینە ناو سوپای دوژمن و فرە سەنگەر و پەرتەوازەیان بکەین. ئا بەم شێوەیە ئێمەی یەك دەست و یەکگرتوو دەکەوینە بەرامبەر دوژمنێکی لەت وپەتی لێك جیا، واتە ئێمەی زۆر و زەوەند لە بەرامبەر دوژمنێکی کەم.

١٥- ئەگەر ئێمە توانیمان بە سوپایەکی چاك و چالاکەوە هێرش بکەینە سەر سوپایەکی خراپۆکە و ڕەشۆکی، دوژمنەکانمان دەکەونە ناو تەنگانەیەکی زۆر خراپەوە (توشی بەڵای ناگەهان دەبن).

١٦- ئەو شوێنەی کە ئێمە مەبەستمانە هێرشی بکەینە سەر نابێت یەك کەس چیە بیزانێت، چونکە دواتر دوژمن ناچار دەبێت لە شوێنێك زیاتر خۆی بۆ هێرشی چاوەڕوانکراو ئامادە بکات، بەم جۆرە سوپای پەرتەوازەی دوژمن بەزۆر ئاڕاستە دابەش دەبێت بەمشێوەیە ئەو هێزەی کە ڕووبەڕووی دەبینەوە لەبەرامبەر هێزی ئێمەدا کەمە[٣].

١٧- هەر لەبەر ئەوە ئەگەر دوژمن پێشڕەوی لەشکرەکەی بەهێز کردبێت ئەوا پاشەنگی هێزەکەی لاواز دەبێت، ئەگەر دوژمن پاشەنگی هێزەکەی بەهێزکردبێت ئەوا پێشڕەوی لەشکرەکەی لاواز دەبێت. ئەگەر باڵی چەپی لەشکرەکەی بەهێز کردبێت ئەوا باڵی ڕاستی لەشکرەکەی لاواز دەبێت،ئەگەر باڵی ڕاستیشی بەهێزکردبێت باڵی چەپی لاواز دەبێت، خۆ ئەگەر هاوکاری سەربازی بۆ بەهێزکردنی هەموو لایەکان بنێرێت لە هەموو لایەکەوە لاواز دەبێت.

١٨- خۆ ئامادەکردن بۆ بەرگری کردن دەبێتە هۆی کەمبونەوەی ژمارەی سەربازان لە خاڵەکانی بەرگریدا. ئینجا ئەگەر وا لەدوژمن بکەین خۆی ئامادە بکات بۆ هێرشی ئێمە، ئەوا لە ڕووی

ژمارەوە سوپاکەمان باڵادەست دەبێت (لەو حاڵەی کە هێرشەکەی لێوە دەکەین).

١٩- زانینی شوێن و کاتی ڕوودانی شەڕەکە وامان لێدەکات هەر لە دوورەوە هێزەکانمان گردبکەینەوە(چەك لە شان بۆ شەڕ ئامادەبین) [٤].

٢٠- ئەگەر کات و شوێنی ڕوودانی شەڕەکە نەزانراو بوون باڵی چەپی لەشکرەکە ناتوانێت بە فریای باڵی ڕاست بکەوێت. بە هەمان شێوە باڵی ڕاستی لەشکرەکە دەستە وەستانە لە یارمەتی دانی باڵی چەپی لەشکرەکە. پێشەنگی لەشکرەکە ناتوانێت یارمەتی پاشەنگی لەشکرەکە بدات. پاشەنگیش لە پشتیوانی پێشرەو دەستە پاچەیە. ئەدی چ ڕوودەدات ئەگەر دوورترین بەشی سوپا سەد لی[٥] لە سوپاکەوە دوور بوو نزیکترین بەشیش چەند لییەك دوورکەوتبوەوە.

٢١- ئەگەرچی بەپێی خەمڵاندنی من بێت هەرچەندە ژمارەی سەربازانی دوژمن لە هی ئێمە زیاتر بێت ئەو شتە هیچ لە بابەتی سەرکەتن ناگۆڕێت، بگرە دەتوانم بڵێم: سەرکەوتن بۆ خۆم مسۆگەر دەکەم.

٢٢- ئەگەر چی دوژمن بە ژمارە زیاتر بوو ( بەهێزتر بوو) دەتوانین وایان لێ بکەین کە شەڕیان پێ نەکرێ. نەخشە ڕێگایەکی

وا دابنێ تاوەکو پیلانەکانی دوژمن بۆ خۆت ئاشکرا بکەیت. گریمانەی سەرکەوتنی دوژمن تاوتوێ بکە!!!.

٢٣- دوژمن تورە بکە[٦] و بیخرۆشێنە هەروەها شێوەی ڕەفتاری بناسە، ئاخۆ گورجوگۆڵە یاخود سست و خاوە؟ دوژمن ناچار بکە تاوەکو خۆیت نیشان بدات بەو جۆرە خاڵی لاوازی ئەوت بۆ ئاشکرا دەبێت.



٢٤-بە وردیی و وریایی لەشکری دوژمن لەگەڵ لەشکری خۆت بەراورد بکە، بۆ ئەوەی بزانیت ئاخۆ خاڵی بەهێز و لاوازی لە کوێیە؟

٢٥- باشترین شت کە بۆ جێبەجێکردنی فرت و فێڵ و جموجۆڵەکانت پێی هەڵبستی ئەوەیە کە فرت و فێڵەکانت بشاریتەوە. بەشاردنەوەی ڕێکخستنەکانت لە سۆسەی سیخورە

زۆرزانەكان سەلامەت دەبێت و لە پیلانی كەسە بیرمەندەكان بەدوور دەبێت.

٢٦- جا چۆن سەركەوتن دێتە دەست ئەگەر پشت بە فروفێڵی دوژمن ببەستی ؟ ئەوە ئەو شتەیە كە خەڵكی سادەش ناتوانن لێی حاڵی بن.

٢٧- هەموو سەربازان دەتوانن فرو فێڵەكان ببینن كە بەهۆیانەوە سەركەوتوو دەبن. بەڵام كەس ناتوانێت ئەو نەخشە ڕێگایە (strategy) [٧] ببینێت كە سەركەوتن پێیەوە دێتەدی.

٢٨- ئەو فرت و فێڵە دووبارە مەكەوە كە جارێك سەركەوتنت پێیەوە بەدەست هێناوە بەڵام ڕێكارەكان دیاری بكە كە لە هەلومەرجی گونجاو پەیڕەویان لێبكەیت [٨] .

٢٩- پێچ وپەنای سەربازی (تاكتیك) زۆر لەئاو دەچێت لەباری ئاساییدا ئاو لەشوێنەبەرزەكانەوە دەردەچێت و بەگوڕ دێتە خوارێ.

٣٠- لەشەڕدا، دەبێت خۆ لەخاڵی بەهێزی دوژمن بە دوور بگرین و لە خاڵی لاوازیان بدەین . (وەكو ئاو بەدرزو كەلێنان دادەچێت و ڕێڕەوێك بۆ خۆی دروست دەكات)

٣١-ئاو ڕێڕەوی خۆی دیاری دەكات بەپێی سروشتی ئەو خاكەی بەسەریدا دەروات. سەربازیش لەپێناو بەدەست هێنانی هۆیەكانی

سەرکەوتن کاردەکات بەڵام بە گوێرەی ئەو دوژمنەی کە ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

٣٢- وەکو چۆن ئاو بەیەك شێوە نامێنێتەوە بەهەمان شێوە دۆخی چەسپاو و نەگۆڕ لە شەڕێدا بوونی نییە.

٣٣- ئەو کەسەی کەدەتوانێت تاکتیکی خۆی بەگوێرەی دوژمنەکەی بگونجێنێت سەرکەوتن مسۆگەر دەکات، دەتوانین بەو سەرکردەیە بڵێین لە ئاسمانێ بەربۆتەوە [٩].

٣٤- هەرگیز پێنج توخمەکان[١٠] بەسەریەکدا زاڵ نابن ، وەکو چوار وەرزەکان (کەژەکانی) ساڵ یەکێ بۆ یەکێکی تری بە جێدەهێڵێت.ڕۆژی کورت ( ڕۆژانی زستان ) و ڕۆژی درێژمان( ڕۆژانی هاوین ) هەیە. هەروەها مانگی تابان و مانگی یەك شەوەمان هەیە[١١][١٢].

پوختەی بەشی شەشەم:

لەم بەشەدا سون لەباسێکی زۆر گرینگ دواوە ئەویش خاڵە لاوازەکان بۆ خۆ لێپاراستن و کەمکردنەوەیان هەروەها لەخاڵە بەهێزەکانیش دواوە تا بەهێزتریان بکەین.

لێرەدا تەنها باسی خاڵە بەهێزەکان دەکەین چونکە پێچەوانەی ئەمانە خاڵی لاوازن:

١- ڕۆیشتن بۆ مەیدانی شەڕێ پێش هاتنی دوژمن، زانین و کات و شوێنی شەڕەکە.

٢- سەلماندنی ویست و داخوازی خۆت (خۆزاڵکردن).

٣- تێکدانی هەموو بارودۆخێکی لەبار و گونجاوی دوژمن.

٤- دەستخستنی زانیاری تەواو دەربارەی دوژمن تا لە شوێنی کارەی بدەی.

٥- شاردنەوەی نەخشە و پلانەکانت. چەواشەکردنی دوژمن.

٦- دامەزراندنی سوپایەکی یەکگرتوی چالاك.

٧- دانانی ڕێککاری گونجاو بۆ هەلومەرجی تایبەت.

٨- سون پێداگری زۆر لەسەر ئەوە دەکات کە ئەو شوێنەی لای دوژمن بەهادارە و دوژمن چاوی تێبڕیوە تۆ ئەو شوێنە بگرە. ئەو کەسەی دەیەوێت لە هەموو لایەنێکەوە بەهێزبێت بۆی ناچێتە سەر و لەهەموو لایەنێکەوە لاواز دەبێت.

## پەراوێزەکان:

١) واتە: بۆ ئەوەی بەرگری و خەبات و نەبەردییەکی بێ وێنەت هەبێت. لەسەرت پێویستە هەموو لایەنێك (شوێنێك بەهێز و پتەو بکەیت – تاوەکو دڵنیابیت خۆ ئەگەر لە هەر لایەك هێرشت بۆ بکەن تۆ خاترجەمی. بەڵام ئەو ئالیەی پێشبینی هێرشی لێ دەکرێت با زۆرتر تۆکمە بێت و جەختی سوپاکەت بخەرە ئەو شوێنە.

٢) ئەگەر دوژمن شەڕکەر بوو ئەوا لە هەوڵی ئەوە دابە کە ڕێی پەیوەندی و گەیاندنی لێببڕیت هەروەها وای لێ بکە پاشەکشە بکات بەوەی ڕێگای یارمەتی لێبگرە ئەویش ناچاردەبێت بکشێتەوە. ئەگەر خۆت ویستی شەڕت هەبوو ئەوا هێرش بکە و ئامانجی هێرشەکەشت با سەرانی لایەنی دوژمن بێت.

٣) لەشەڕی نێوان پێشمەرگە و داعشدا کەناڵەکانی ڕاگەیاندنی کوردی ڕۆڵێکی خراپ و نابەرپرسانەیان دەبینی تەنانەت کات و شوێن و جۆری هێزو ژمارەی پێشمەرگە و هەموو ورد و درشتێکی تایبەت بە شەڕەکەیان پێشکەشی چەتە تیرۆرستەکانی داعش دەکرد هەر بۆیە تا ڕاپۆرت و هەواڵی ئەو کەناڵانە لە کار بوون زۆربەی جاران پێشمەرگە زیانی زۆری لێدەکەوت دوای زار بەستانی ئەم ڕاگەیاندنکارانە حاڵی برا پێشمەرگەکان باشتر بوو.

٤) یەکێك لەخاڵە گرینگەکانی شەڕ ئەوەیە کات و شوێنی شەڕەکە بزانیت تاوەکو بەپێی ئەو کات و شوێنە پلانی خۆت دابنێیت.

٥) لی : Li : پێوانەیەکی چینییە بۆ پێوانی دووری بەکاردێت یەك لی یەکسانە بە ٦٠٠م.

٦) ئەگەر دوژمن تورە و بێزار بکەیت ئاوا ئەوانیش کاردانەوەیان دەبێت خۆ ئەگەر کاردانەوەیان هەبوو زۆربەی نهێنی ئەوانت بۆ ئاشکرا دەبێت.

٧) strategy : لەشکرگێڕی، دانانی پلانی جەنگ و لەشکر بەڕێوەبردن. بۆ زێدە زانین بڕوانە پێشدەستی ئەم کتێبە

٨) سەرکەوتن تەنها یەك شتە بەڵام ڕێگاکانی گەیشتن پێی ئەژمار ناکرێت.

٩) لەدەقە ئینگلیزیەکەدا دەڵێت (heaven-born captain) لە عەرەبیەکەدا دەڵێت (القائد الـمُلهم) یاخود (هدیه السّماء). لەناو کوردان ئەگەر کەسێك زۆر خۆشەویست و لە دڵا شیرین بێت یاخود گرینگ و هێژا بێت بە تایبەتی ئەو منداڵەی دوای چەند ساڵان دەبێتە خەڵاتی دایبابی پێی دەڵێن لە ئاسمانێ بەربۆتەوە.

١٠) پێنج توخمەکان بریتین لە: ئاو، ئاگر، دار، کانزا، زەوی (خاك) بەڵام لەدیرۆکی دێرینی زۆربەی میللەتان باس لە چوار توخم کراوە کە سروشتی لەسەر بەندە: ئاو، ئاگر، خاك و هەوا.

١١) ئەم نمونە هێنانەوەی سون تزو پێمان دەڵیت: شەڕ وەکو هەر بارێکی تری سروشتە – هەرگیز لەسەر یەك بار نامێنێتەوە و هۆکاری نەگۆڕی نییە بەپێی کات و شوێن گۆرانکاری ڕوودەدات.

١٢) لە چاپە عەرەبییەکەی ئەکرەم موئمین ئەم بەندە بوونی نییە نازانم لۆ؟

# بەشی حەوتەم

## مانۆڤەر: maneuvering[1]

١-سون تزو وتویەتی: سوپا سالار لەشەڕدا فەرمان لەپاشای (ولآت ) وەردەگرێت.

٢-لەسەر سوپاسالار پێویستە لەشکرەکەی کۆبکاتەوە و بەهێزی بکات پێش ئەوەی بنکەی سەربازی دابمەزرێنێت، هەروەها لەسەری پێویستە کە بەشەکانی سوپاکەی تێکەڵ بە یەکتری بکات، لەگەڵ یەکتریان بگونجێنێ[2].

٣- دوای ئەوە، ڕۆڵی مانۆڤەری بە پیلان دێتە گۆڕێ. کە هیچ شتێ لەمە سەختتر و ئاڵۆزتر نییە. هۆکاری سەختی مانۆڤەر لەوەدایە کە دەبێت شتی ناڕاستەوخۆ (فرت و فێڵ) بگۆڕی بۆ ڕاستەوخۆ ئەوەی لەدژی تۆیە وەهای لێبکەیت بەسودی تۆ بجولێتەوە.

٤- ڕێگایەکی دوور و درێژی بە پێچ بگرە (بۆ گەیشتن بە شەڕگە) تا دوژمن لاڕێ بکەی و لەخشتەی ببەیت، بەر لە دوژمن

نەخشەڕێ بۆ سەرکەوتنی خۆت دابنێ. ئەم بەلارێدا بردنە بەکارامەیی و لێهاتویی گەواهی زیرەکی تۆن.

٥- مانۆڤەرکردن بەسوپا زۆر بەسودە، بەڵام مانۆڤەرکردن بە سوپایەکی زۆر و بێ سەروبەر یەکجار مەترسیدارە.



٦-ئەگەر تۆ سوپایەکی تەواو بەهەموو کەرەستە و پێداویستییەوە بنێریت تاکو سود و هەلێکت بۆ وەدەست بخەن. ئەگەری ئەوە هەیە کە زۆر درەنگ بگەن. لەلایەکی ترەوە ئەگەر دەستەیەکی خێراو بەپەلە (لەسوپا)بۆ مەبەستێك بنێریت ئەوکارەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە کەرەستە و کەلوپەلی دەستەی دوای ئەم دەستەیە لەپێناوی ئەواندا بروات[٣].

٧-بۆیه ئەگەر فرمان بەسوپاکەت بکەی قوڵی لێهەڵماڵن و دەست بەڕۆیشتن بکەن و شەو ڕۆژ لێکبدەن، بێ پچران و سانەوە دوو هێندەی بڕی ڕێگا ببڕن و سەد لی (٥٠ کم) تەی بکەن تا سود و کەلکێك وەدەست بخەن ئەوا سەرکردەی هەرسێ باڵی سوپا دەکەونە بەردەستی دوژمن.

٨-سەربازە ئازاو پاڵەوانەکان دەکەونە پێشڕەوی سوپاکە و سەربازە بێ هێزەکانیش دەکەونە دوای سوپاکە. بەپێی ئەو نەخشەیە تەنها یەك لەدەی سوپاکەت دەگەنە شوێنی مەبەست[٤].

٩-ئەگەر تۆ پەنجا لی(٢٥کم) ببڕیت تاکو دەستی خۆت بەپێش دەستی دوژمن بخەی (لەدوژمن زیرەکتر و فێڵبازتربیت) ئەوا سەرکردەی باڵی یەکەمی سوپاکەت لەدەست دەدەیت. تەنها نیوەی سەربازەکانت دەگەنە شوێنی مەبەست. (لەماندویەتی و هیلاکیدا دەپسێن).

١٠- ئەگەر سی لی(١٥ کم) ببرین بۆ هەمان مەبەست.دوو لەسەر سێی سوپاکەت دەتوانن بگەنە جێی مەبەست (بەسەلامەت)[٥].

١١- دەبێت لەوە بگەین کەسوپا بەبێ کاروانی کەرەستە و کەلوپەلی لەناو دەچێت سوپا بەبێ ئازوخە لەناو دەچێت، سوپا بەبێ تفاق لەبەین دەچێت.

١٢- نابێت لە هیچ هاوپەیمانیەك بەشداربین تاوەکو شارەزای نەخشەی هاوسێیانمان نەبین.

١٣- هەتا شارەزای ڕووکاری وڵاتەکە نەبین و ئاشنای چیا و دارستان و کەمین و هەورازو نشێو و زۆنگاو و زەلکاوەکان نەبین شایستەی سەرکردایەتی و ڕێبەری سوپا نابین.

١٤- ئێمە ناتوانین سود لە سروشت وەربگرین، ئەگەر خەڵکی ناوچەکە و چاوساغمان لەگەڵ نەبێ.

١٥- ئەگەر لەشەڕدا هەڵخەڵەتێنەر بیت، سەرکەوتوو دەبیت.

١٦- دەبێت بڕیاری یەکڕیزی و یەك دەستەیی یاخود دابەشکردنی سەربازان بەگوێرەی هەلومەرجی شەڕەکە بدرێت.

١٧- وەکو با بە لەخێرایی، لە تۆکمەیی و پتەویدا دارستان بە، (چۆن دارەکان لەنزیك یەکترن و پشتیوانی یەکتر دەکەن لەبەر هەر شاڵاوێك کە بەرەو ڕویان بێت)

١٨- له هه‌ڵكوتان و تالآنی وه‌ك ئاگریه‌، وه‌كو شاخی سه‌ركه‌ش جێگر و چه‌سپاو به‌.

١٩- با نه‌خشه‌ و پلانت نادیاربن وه‌كو شه‌و بن كه‌س سه‌ری لێ ده‌رنه‌كا. كاتێك جموجۆڵ ده‌كه‌یت وه‌كو هه‌وره‌ بروسكه‌ له‌ دوژمن بده‌و دایان وه‌شێنه‌.

٢٠- كاتێك خێرو بێری دێهاتان تالآن ده‌كه‌یت، ده‌ستكه‌وته‌كه‌ له‌نێو سه‌ربازانت دابه‌ش بكه‌. كاتێك ناوچه‌یه‌ك داگیر ده‌كه‌یت بیكه‌ به‌چه‌ند پشكێك تا سه‌ربازه‌كانت لێی سودمه‌ند بن(٦).

٢١- ورد و له‌سه‌رخۆبه‌پێش ئه‌وه‌ی جۆڵه‌ بكه‌یت.

٢٢-ئه‌و كه‌سه‌ به‌شی سه‌ركه‌وتنه‌ كه‌چاك فێربوبێ چۆن فرِوفێڵآن بكات، ئه‌وه‌ هونه‌ری مه‌شق و پیلانی سه‌ربازیه‌.

٢٣- له‌كتێبی سه‌رپه‌رشتی سه‌ربازیدا هاتوه‌: له‌به‌ره‌ی جه‌نگدا وتار زۆر برِ ناكات و ناگاته‌ گوێی هه‌موان. بۆیه‌ ته‌پڵ لێدان و زه‌نگڵ لێدان پێویستن. ناتوانرێت هێما و دروشمه‌ ئاساییه‌كان به‌چاكی ببینرێت بۆیه‌ پێویست ده‌كات ئالآ و به‌یداغان هه‌ڵده‌یت.

٢٤- زەنگڵ و تەپڵ و ئاڵا و بەیداغ ئەو شتانەن کە بەهۆیانەوە چاو و گوێی سوپای دوژمن لەیەك خاڵی دیاریکراو دەڕوانن.

٢٥- بەمشێوەیە سوپایەکە دەبێتە یەك لاشەی یەکگرتوو. ئەوجا مەحاڵ دەبێت کە سەربازی ئازا بتوانێت بەتەنێ پێشڕەوی بکات هەروەها سەربازی ترسنۆکیش ناتوانێت بەتەنها بکشێتەوە و بۆی دەربچێت. ئەمەیە هونەری سەرپەرشتی سوپایەکی گەورە(٧).

٢٦- لەشەڕی شەوێدا زیاتر دروشمی ئاگر و تەپڵ بەکاربهێنە. لەشەڕی ڕۆژیشدا زیاتر ئاڵاو بەیداغ بەکاربهێنە. بەو مەبەستەی کاریگەری لەگوێ و چاوی سوپاکەت بکات(٨).

٢٧-لەوانەیە هەموو سوپاکە جۆش و خرۆشی دابمرکێتەوە لەوانەیە فەرماندەی سوپاش بیرو بۆچونی بگۆڕێت(٩)!!.

٢٨-لەبەیانیدا هۆش وجۆشی سەرباز لەوپەڕیدایە.لە نیوەڕۆیاندا لەکزی و بێ تینی دایە. لێ لە ئێواران بیر و هزری سەرباز هەر لەسەر ئەوەیە کە بۆ بنکەکەی خۆی بگەڕێتەوە(١٠).

٢٩- هەر بۆیە ئەفسەری شارەزا خۆی لەشەڕکردن لەگەڵ سوپایەکی بەجۆش و خرۆش بەدوور دەگرێت بەڵکو لەوکاتە هێرش

دەکات کە ئەو سوپایە سست و خاوە و مەیلی گەڕانەوەی هەبێت. ئا ئەمەیە هونەری تێڕوانین لە بارودۆخی دەرونی.

٣٠-پێویستە بە ڕێکوپێکی و لەسەرخۆی بمێنیتەوە وچاوەڕوانی سەرهەڵدانی ئاژاوەو دووبەرەکی بیت لەنێو ڕیزەکانی سوپای دوژمن. ئائەوەیە هونەری مانەوە بەهێمنی  و لەسەرخۆیی.

٣١-پێویستە لەئامانج و مەبەست نزیك بین (لەشەڕگە نزیك بین) لەکاتێکدا هێشتا دوژمن لەو ئامانجە دوورە. بەئاسودەی چاوەڕوانی دوژمن بە لەکاتێکدا دوژمن لە ڕەنجدان و ئارەقە ڕشتنە. دەبێت تۆ تێروپڕبیت لەکاتێکدا دوژمن لەبرسان لاکەی دێت. ئەمەیە هونەری بەفیڕۆنەدانی تین و توانای خۆت[11].

٣٢-پێوستە خۆت بە دوور بگری لەبەرامبەر بەرپەچدانەوە و بەرەنگاری دوژمن کە ئالاَکانی بە ڕێك و پێکی دانراون[12]. دەبێت هێرش نەکەینە سەر سوپایەك کەبەنەخشە و پلانێکی ڕێکەوە دێت و ڕیزەکانی سوپاکەشیان تۆکمە و تژی بڕوا بەخۆبونە. ئەمە پێی دەوترێت هونەری لێکۆڵینەوە لە هەلومەرج و بارودۆخەکان.

٣٣-بەگوێرەی دەستوری سەربازی نابێت لەدژی دوژمنەکەت بەرەو ژوور بڕۆیت، هەروەها نابیت ڕێگایەکی لێبگرین و شەڕیشی لەگەڵدا بکەین لەکاتێکدا ئەو بەرەو خوارێ دەروات.

٣٤-بەدوای ئەو دوژمنە مەکەوە کە هێندە بەخێرایی ڕادەکات کەوا دەزانی ئێستا دەفڕێت. هێرش مەکە سەر ئەو سوپایەی کە جۆش و خرۆشیان هەیە و ڕۆحی مەعنەوییان بەرزە.

٣٥-نەهێڵیت دانەخورەی دوژمن بیت (لەلایەن دوژمنەوە فێڵت لێبکرێ) بەرهەڵستی سوپایەك مەکە کە بۆ وڵاتی خۆی دەگەڕێتەوە.

٣٦-کاتێك تۆ گەمارۆی سوپایەکت دا، کەلەبەر و ڕێچکەیەك بۆ ئەو سوپایە بهێڵەوە تا پێیدا هەڵبێت. پاڵە پەستۆیەکی زۆر مەخەرە سەر دوژمنێکی بێ ئومێد.

٣٧-(ئەدی کاکە) ئەوە هونەری شەڕییە.

بەخەست و خۆڵی ئەم بەشە لەم خاڵانە کورت دەکەینەوە:

١- ڕێکخستن و دابەشکردن و بونی پلان بۆ سوپا زۆر گرینگە. چونکە سوپا شەڕ دەکات و تەوەری سەرەکی بابەتەکەیە.



٢- مانۆڤەر سەرکەوتن بۆتۆ یەکلا دەکاتەوە. مانۆڤەر چیە؟

٣- ڕێگە بڕینی دوورو درێژ زەرەرمەندت دەکات.

٤- دەبێت سەرلەشکر ئەم سیفەتانەی هەبێت : وریایی ، شارەزایی وڵات، توانای بڕیاردان، خێرایی، تۆکمەیی، دادپەروەری.

٥- چۆن فێڵ لە چاوی دوژمن دەکەیت؟ لەشەودا چی دەکەیت؟ لەڕۆژدا چی دەکەیت؟

٦- جۆش و خرۆش دەزگای هاندانی سەربازن بۆ شەڕ.

٧- دواى هێرش چۆن مامەڵە لەگەڵ دوژمن بکەین؟

## پەراوێزەکان:

١) مانۆڤەر: maneuvering به دوو شێوه نوسین هاتوه(manoeuver، maneuver )به (verb– کار) واته ١- مناوەره به لەشکرکردن. ٢- پیلانی زۆرزانانه دانان، پیلان گێران، بەفێڵ ئامانجی خۆ هێنانەدی.( فەرهەنگی ئازادی ، لا ٥٦١)

ئەم وشەیە مانای (نمایشی سەربازی ، فێڵ و تەڵەکەش) دەدات، ڕەگاوەژوی وشەکە: لەسەدەی هەژدەوە هاتۆتە ناو زمانی ئینگلیزی بە مانای (tactical movement: جموجۆڵی بەپێچ و پەنا) وشەکە لەبنەڕەتدا لاتینییە و لە manus:دەست + operari: کاردەکا.

جا بۆ زانیاریتان لەم بەشە وشەی مانۆڤەر وەکو خۆی بەکاردەهێنین.

٢) لە سوپادا نابێت چینایەتی هەبێت پێویستە پلەدار و سەربازێکی ئاسایی بەیەکەوەبن لە مێژوی کۆنی چینی دا هاتووە: سون تزو وتویەتی: پەیڕەوی گشتی سەربازی دەڵێت: ئەو سوپایەی بەرەو شەڕ دەچێت پێشەکی دەبێت ڕەگی ناتەبایی و دڵ ئێشان

دەربهێنیێ و دوژمنی ناوخۆ پێش دوژمنی دەرەکی لەناو ببات ، کوردیش دەڵێت: دار کرمی لەخۆی نەبێت هەزار ساڵ دەژی.

٣) هەمیشه سون پێداگیری لەسەر ئەوە دەکات کەنابێت سوپا ڕێگەی دوور و درێژ ببڕێت چونکه ئازوخه و بڕی تێچوی زۆری دەوێت.

٤) واتا زۆری لەسەربازەکانت مەکه بۆئەوەی ڕێگایەکی دوور و درێژ بە ماوەیەکی کەم ببڕن بۆ مەبەستێکی دیاریکراو – هەموو شتێ لەپێناوی خێرایی دامەنێ.

٥) ئەگەر مەبەستت شوێن و کارێکی دیارکراو بێت و بتەوێت ڕێگەیەکی دوور ببری کە (٥٠) لی بێت ئەوا تەنها نیوەی سوپاکە دەتوانن بگەنە شوێنی مەبەست بەڵام ئەگەر ڕێگاکە کورت بکەینەوە بەڵام هەمان مەبەست هەبێت ئەوا دوو لەسێی سوپاکە دەگاتە جێ کەواتە چەندە ڕێگایەکە دوور و درێژ بێت زەرەر و زیان زیاتر دەبێت، کەمتر لە سوپایەکەت دەگەنە ئامانج.

٦) بەڵکو سەربازان کشت وکێڵی زەویەکە بکەن و سودی خۆیانی لێ وەربگرن.

٧) شارەزایانی سەربازی دەڵێن تاوانی ئەو کەسەی بەبێ فەرمان پێشڕەوی دەکات وەکو تاوانی ئەو کەسەیە کە هەڵبێت و پشت لەشەڕ بکات.

٨) هەرچەندە ئەو ڕەفتارە سەربازییانە ئێستا گۆڕاون و شێوەی تر بەکاردێت بەڵام ئەو وتانە پێمان دەڵێن مێژووی شەڕی سەردەمانی کۆن چۆن بووە.

٩) لێکۆڵەران دەڵێن: ئەگەر ڕۆحی ڕك وتوڕەیی لەناو سوپایەکی گەورەدا بڵاوبۆوە کاریگەری ئەو سوپایە زۆر کەم دەبێتەوە هەربۆیە پێویستە چاوەڕوان بین تا هیمەتی دوژمن دەڕوخێت و ساردەبنەوە ئەوجا گەڕی خۆمان دادێ.

١٠) مێژوو دەگێڕێتەوە کە سەربازانی ڕۆمانی لەشەڕێکدا لەگەڵ هانیپاڵیەکان شکستیان هێنا چونکە ڕۆمانییەکان بە ڕۆژوو بون و نانی بەیانیان نەخواردبوو.

١١–ئەم بەندە دووبارەی بەندی یەکەمی بەشی شەشەمە. بۆ زانیاری بەگوێرەی وتەی فن الحرب – وەرگێڕانی رؤوف شباءك لەخاڵی ٢٣ تا ٣٧ گومانی تێدا هەیە کە هی سون تزو بن.

١٢–ئەگەر سوپایەك ئاڵاکانی شەکاوە و چەسپاو بن واتە سوپایەکی بەهێز و ڕێك و پێکە.

# بەشی هەشتەم

## هەمەچەشنەیی فرتوفێڵی سەربازی[١]

١ـ سون تزو وتویەتی: لەشەڕدا، سوپاسالار فرمان لەپاشای وڵات وەردەگرێت. پاشان سوپاکەی کۆدەکاتەوە وهێزەکانی ئامادە دەکات.

٢–کاتێك کەوتیە ناو وڵاتێکی ناخۆش و ناهەموارەوە[٢].نابێت چادر هەڵبدەیت (بنکە دابمەزرێنیت). پێویستە هاوپەیمانی لەگەڵ ئەو وڵاتانە ببەستیت کە رێگەکانیان بەیەکتر بەستراون[٣] و ڕێگای فراوانیان هەیە. لەوشوێنەدا مەمێنەوە کەشوێنێکی لاچەپ و مەترسیداربێت.ئەگەر لەشوێنێکدا گەمارۆدراو بویت فرت و فێڵ بەکاربهێنە. ئەگەر کەوتیە شوێنی نائومێدی دەبێت شەڕ بکەیت.

–٣

١ – ڕێگای وا هەیە نابێت پێیاندا گوزەر بکەیت[٤].

٢– سوپای وا هەیە نابێت هێرشیان بکەیتە سەر[٥].

٣– شاری وا هەیە نابێت ئابلۆقەی بدەیت[٦].

٤ –شوێنی وا هەیە نابێت شەڕی تێدا بکەیت[٧].

٥-پاشا فرمانی وای هەیە نابێت گوێرایەڵیان بکەیت[٨].

٤-ئەو سەرکردەیەی کە لە سود وکەڵکی فرتو فێڵی هەمەچەشنە بزانێ. هەر خۆی دەزانێت چۆن ڕەفتار لەگەڵ لەشکرەکەی دەکات.

٥-ئەو سەرکردەیەی کە سودەکانی (جۆرەکانی تاکتیک)نەزانێت با شارەزای بست بەبستی وڵاتەکەش بێت هێشتا ناتوانێت ئەو زانینەی بەکردار بسەلمێنێت و کەڵکی لێوەربگرێت.



٦-ئەگەر شەڕخوازێ ئاشنای هونەرە هەمەچەشنەکانی پلان دانان نەبێت هەرچەندە شارەزای پێنج سودەکانیش[٩] بێت ناتوانێت سەربازەکانی خۆی بەشێوەیەکی باش بەکاربهێنێت.

٧-سەرکردەی زۆرزان و زیرەك لەپلانەکانی خۆیدا سود و زیان بەیەکەوە لەبەر چاو دەگرێت.

٨-ئەگەر بەم رێگایە پێشبینی سودی ئێمە هاتەدی و بوو بەڕاستی ئەوا ئێمە لەجێبەجێکردنی خاڵی سەرەکی پلانەکەمان سەرکەوتوو دەبین.

٩-لەلایەکی ترەوە ئەگەر لەناو جەرگەی سەختی و ناخۆشیدا بوین و هەمیشە ئامادەبوین و لە هەوڵی بەدەست هێنانی سود و کەڵکی خۆمان بین لەوانەیە بتوانین خۆمان لەو بەدبەختیە ڕزگار بکەین.

١٠-بەهۆی ناخۆشی و ئاشوب نانەوە ژمارەی دوژمنان کەمبکەوە. کێشەیان بۆدروست بکە و وایان لێبکە هەمیشە سەرقاڵی کێشەو ئاریشەبن. بەردەوام بە لەفرویدانیان. وایان لێبکە بۆ هەموو لایەك هێرش بکەن.

١١-هونەری شەڕ فێرمان دەکات: هەرگیز پشت بەو ئەگەرانە نەبەستن کە پێمان دەڵێن دوژمن پەلامارمان نادات. بەڵکو دەبێت لەسەر ئەو ڕاستیە بین کە ئێمە لەشوێنێکی واین (شوێنێکی دڵنیا و بێ ترس کە هیچ دوژمنێك) ناتوانێت هێرشمان بکاتە سەر.

١٢-پێنج هەڵەی ترسناك هەن کاریگەری خراپ دەکەنە سەر هەموو ئەفسەرێك:

١- بێباکی و سەرکەشی، بەرەو لەناوچونت دەبەن[١٠].

٢- نامەردی و ترسنۆکی کەدەبێتە هۆی بە دیلگیران[١١].

٣- تورەیی و تڕۆیی (تورەو تۆسن ، توندە میزاج) کە هەر بەوتەیەکی نابەجێ (ئەو سەرکردەیە) هەڵدەچێت ودەماری دەگیرێ.

٤-هەستەوەرییبون بەناوبانگ و ڕێز وا لەو سەرکردەیە دەکات زۆر بەتەنگ و شەرم و ئابڕوی خۆی بێت.

٥- ئێجگار پەرۆش بون بۆ سەربازەکانی خۆی، ئەمەش وا لەو سەرکردەیە دەکات کە دوودڵ و ناڕەحەت بێت[١٢].

١٣-ئەو پێنج هەڵە کوشندەیەی سەرلەشکر کاریگەری یەکجار خراپیان دەبێت لەسەر بەرێوەبردنی کاروباری شەڕەکە.

١٤- لەکاتی هەرەس هێنانی هەر سوپایەك و کوژرانی سەرکردەکەی بە دڵنیایی هۆکاری ئەو شکستە لەو پێنج خاڵە ترسناکەی سەرەوە بەدەر نییە، دەبا ئەو پێنج خاڵە لەبەر چاوت بن و بەجوانی بیریان لێبکەوە (وەکو ئەڵقە لەگوێیان بکە).

**گوڵبژێری ئەم بەشۆکە :**

١- لەهەندێ ڕێگاو شارو شوێن شەڕ مەکە.

٢- پێشبینی هەموو شتێك بکە لە خۆت و لە دوژمن.

٣-کێشەنانەوە لەناو ڕیزەکانی دوژمن ئەلفبای تاکتیکی سەربازییە.

٤- فریودانی دوژمن و سەرلێشێواندنی.

٥-نابێت ڕێگە بەڕودانی ئەم پێنج هەڵە کوشندەیە بدەیت (سەرکەشی، ترسنۆکی، تڕۆیی، هەستەوەری، زۆرپەرۆشی)

باوەڕێکی سەیر!

ئەم بەشە ناوێکی تریشی لێیە ئەویش (نۆ تاکتیکی سەربازی)یە خۆی ئەم بەشە لە (١٤) بەند پێکهاتووە بۆچی ناویان بە (٩ تاکتیك لێناوە)

-دەڵێن:سون زۆر گرینگی بە ژمارە نەداوە هەروەها چینییە کۆنەکان پێیان وابوە کە ژمارە نۆ (٩) گرینگترین و گەورەترین ژمارەیە بۆچی؟

ئەوان دەیان وت (٩) لەهەموو ژمارەی پێش خۆی گەورەترە هەموو ژمارەکانی دوای خۆشی هەر لە (١٠- هتد) جگە لە دووبارە بونەوەی (٠ ، ١ ، ٢ ، ... ٨) زیاتر نین کەواتە نۆ لوتکەی ژمارەکانە.

## پەراوێزەکان:

١) هەندێ وای بۆ دەچن کە ئەم بەشە هەندێکی لەناو چوبێت چونکە زۆر کورتە و هەندێ بەندیش ناڕونیان لێ بەدی دەکرێت.

٢) مەبەست پێی ئەو شوێنانەیە کە سەرچاوەی ئاو و خواردەمەنی تێدا نییە و کەشوهەوایەکی لەباری نییە.

٣) گواستنەوەو گەیاندن تێیاندا بە ئاسانییە و ناوچەیەکی گۆڕایین (تەختەلان).

٤) ئەو ڕێگایانەی مەترسی ئەوەیان تێدایە کە دوژمن لێی جێگیربن یاخود کەمینیان تێدا داناوەتەوە.

٥) ئەوسوپایانەی کە ئەگەر هێرشیان بکەیتەسەر ئەگەری هەرەس و بەزینت زۆرە کەواتە هێرشیان مەکە سەر.

٦) ئەو شارانەی کە ناتوانیت داگیریان بکەیت ئەگەر داگیریشیان نەکەیت زیانی نییە.

٧) شوێنێك کەتۆ سودمەند نەبیت تێیدا یاخود بەئاسانی گەمارۆ دەدرێت.

٨) ئەو فرمانانەی پاشا کە لەگەڵ واقیعی بەرەی جەنگ یەکناگرێتەوە چونکە لەوانەیە پاشا لەناو کۆشتك. ئاگای لەوە نەبێت لەمەیدانی شەڕ چی دەگوزەرێت.

٩- سودەکانی هەمە چەشنەیی تاکتیك کە لەخاڵی (٣) باسکرا.

١٠- هەندێ جار ئازایەتی بەرەو گومڕایت دەبات، هەروەها ئازایەتی بەتەنها هۆی سەرکەوتن نییە بەڵکو سەرکەوتن ڕاوێژ و ژیری و لێکدانەوەی دەوێت.

١١ - ترسنۆکی وات لێدەکات: هەلی گونجاو لەدەست بدەیت. لەکاتی ناخۆشیدا ڕابکەیت و هێندەت حەز بەژیان بێت هەر خوا خواتبێت بگەڕێیتەوە ماڵێ.

١٢) لەم بەندەدا سون مەبەستی ئەوە نییە سەرلەشکر حیساب بۆ سەرباز نەکات (کورد گوتەنی: ماسی گرتن و شەڕوالّ تەڕنەبونیان نەگوتییە) سەرکەوتنیش فیداکاری دەوێت خۆ ئەگەر لە پێناوی سەرکەوتن گیانبازی نەکەیت شەڕ ئێخەت بەرنادات.



بڕوا وایە ئەمە شێوەیەکی سون تزو بێت

# بەشی نۆیەم

# پێشڕەویکردنی سوپا



١- سون تزو وتویەتی: ئەوجا دێینە سەر باسی چادر هەڵدان (دامەزراندنی سەربازگە) و چاودێریکردنی ئەو هێما و ئامازانەی کە لە دوژمنەوە دەردەکەون[١]. بە پەلەپەل لەسەر شاخان بڕۆ و لەسەر ڕۆخی دۆڵان گوزەر بکە[٢].

٢–سەربازگە لەو شوێنە بەرزانە دروست بکە[٣] کەبەر تاون و ڕوو لەڕۆژن.هەرگیز بۆ شەڕکردن بەسەر بەرزاییاندا هەڵمەگەڕێ. ئەوە سەبارەت بە شەڕی سەر شاخانە.

٣– دوای پەڕینەوەت لە ڕووبار دەبێت لەو ڕووبارە دووربکەوییەوە (تا دوژمن چەواشە بێت و بەدواتدا بێت).

٤–لەوکاتەی هێزی دوژمنی داگیرکەر لە ڕووبارێك دەپەڕێتەوە. نەکەی لەناو ئەو ڕووبارە هێرشی بکەیتە سەر.واچاکترەکە لێبگەرێی تاوەکو نیوەی سوپاکە دەپەڕێتەوە پاشان هێرشی بکەیتە سەر.

٥– ئەگەر تۆ بەتاسەی شەڕیش بیت، نابێت لەدەم ڕووباردا بەرەو ڕووی دوژمن ببیتەوە کە دوژمن ناچارە لێی بپەڕێتەوە.

٦–کەشتیەکانت لەشوێنێکی بەرزتر لە هی دوژمن لەنگەر بگرە با بەر تاویش بن بە پێچەوانەی تەوژمی ئاو جوڵە مەکە بۆ ئەوەی بەرەنگاری دوژمن ببیتەوە. ئەمەش سەبارەت بە شەڕی ناو ڕووبارە(ناو ئاو).

٧- لەکاتی تەیکردنی زەلکاوە سوێراوەکان دەبێت تەنها غەمت ئەوە بێت کە زۆر بەخێرایی بەبێ هیچ دواکەوتنێك لەو شوێنانە دەرباز بیت.

٨- ئەگەر لەزەلکاوە سوێراوەکان کەوتیە شەڕەوە، دەبێت وا بکەیت ئاوی سازگار و گژوگیات لەدەوروبەردا هەبێت و دارو و درەختیش بکەونە پشتەوەی سوپاکەت. ئائەمەش دەربارەی شەڕی ناو زەلکاوە سوێرەکان بوو.

٩- لەنزمەلان و وشکاییدا، شوێنێکی وا ئاسان بۆخۆت داگیر بکە کە بەرزایی وای لە باڵی راست و پاشەنگی سوپاکەت هەبێت تاکو مەترسی تەنها لەڕووی پێشەوە ڕووت تێبکات و لەبەشی پشتەوەی خۆت دڵنیاو سەلامەت بیت ئەمەش سەبارەت بەشەڕ لەتەختەلاندا.

١٠- ئەو چوار لکە بەسودەی زانیاری سەربازی ( زانیاری دەربارەی ناوچەی شاخاوی، ڕووبارەکان، زۆنگاوەکان، ناوچەی تەختایی) وا لە ئیمپراتۆری زەرد دەکەن(٥) کەبەسەر چوار پاشاکەی تر (پاشای باکور و باشور و ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا) زاڵ بێت و بۆڕیان بدات.

١١- هەموو سوپایەك شوێنی بەرز بەباشتر دەزانێت لە شوێنی نزم و بەر ڕۆژی لا چاترە لە سێبەری.



١٢-ئەگەر ئاگاداری حاڵ و باڵی سەربازەکانی خۆت بویت و سەربازگەکەشت لەشوێنێکی توندو تەندروست دروست کرد، ئەوا سوپاکەت لە هەموو جۆرەکانی پەتاو نەخۆشی دوور دەبن و پارێزراو دەبن. ئەمەش مایەی سەرکەوتنە(٦).

١٣- ئەگەر گەیشتیە گردێك یان کەناراوێك، بەرتاوەکە داگیر بکە و بەشی ڕاستەی پاشەنگت بدە لێژایی. ئەمە لەسودی سەربازەکانتە و بەمشێوەیەش کەڵکی خۆت لە بارودۆخی سروشتی ڕووی زەوی وەردەگریت.

١٤-كاتێك لەناو وڵاتێك بویت و ویستت لەڕووبارێك بپەڕیتەوە كە بەهۆی شەستە بارانەوە پڕببوو لەكەف و كوڵ، پێویستە چاوەڕوان بیت تاكو بارودۆخەكە ئاسایی دەبێتەوە.

١٥- دەبێت هەتا پێت دەكرێت واز لەوناوچانە بهێنیت و لێشیان نزیك نەكەویەوە كە كەندەڵانی لێژیان هەیە ئاوی بەخوڕی پێدا دەڕوات یان چاڵ و چۆڵی سروشتی هەیە، یاخود شوێنی وێكهاتوی زۆرە یا دارستانی چڕو پڕی هەیە، یان زەلكاو و كەلێن و كەلەبەر تێدایە.

١٦- كاتێك خۆمان لەو چەشنە شوێنانە بەدووربوین، دەبێت وا بكەین دوژمن لەو شوێنانە نزیك ببێتەوە كاتێك ڕووبەڕووی دوژمن دەبینەوە پێویستە لێیان گەڕێین تا پاشەنگی لەشكرەكەشیان دەكەوێتە ناو ئەو شوێنەوە.

١٧- ئەگەر سەربازگەكەت لە نزیكی گردەلانێك، گۆماوێكی بەدەوەن و گیا، چاڵێكی جەنگەڵی، دارستانێكی چڕوپڕبوو، پێویستە ئەو جۆرە شوێنانە بە جوانی بپشكنرێن و لە ناویاندا بگەڕێین چونكە دەگونجێت لەو شوێنانە كەسانێك خۆیان لە بۆسە دانابێت یاخود سیخوڕی فێڵباز خۆیان مەڵاس دابێت.

١٨- كاتێك دوژمن نزيك بويەوە و هێمن و لەسەرخۆ بوو، ماناى وايە ئەو دوژمنە پشتى بەهێزى سروشتى شوێنەكەى خۆى پتەو كردووە.

١٩- كاتێك دوژمن خۆى دوورەپەرێز دەگرێت و دەشيەوێت چەخماخەى شەڕ دابگرسێنێت، ئەمە ماناى وايە (دوژمن) دەيەوێت لايەنى بەرامبەر بەرەو ڕووى بێتەوە دەست بەشەڕ بكات .

٢٠- ئەگەر سەربازگەى دوژمن بەردەست و بەسێنايى بوو، ماناى وايە (دوژمن) تەماى فريودانى تۆى هەيە و دەيەوێت دانەخۆرەت بكات.

٢١- جموجۆڵ و بزوتن لەناو دار و دارستاندا ماناى وايە دوژمن بەرەو ڕوومان دێت بەڵام ئەگەر هەندێ جوڵەجوڵ لەناو گژوگيادا هەبوو ماناى وايە كە دوژمن دەيەوێت گومان لە دڵماندا دروست بكات.

٢٢- بەرزبوونەوەى باڵندان لەكاتى فڕينياندا نيشانەى ئەوەيە كە بۆسە هەيە ترس و سڵكردنەوەى گيانداران ماناى وايە هێرشێكى لەناكاو بەڕێيەوەيە.

٢٣-کاتێك تەپ و تۆز بەری ئاسمانێی گرت واتە گالیسکەی سەربازی لە پێشڕەویدان بەڵام کاتێك تەپ و تۆزەکە نزم بوو هەموو دەوروبەری خۆشی داگرت بوو مانای وایە پۆلێك سەربازی پیادە دێن. کاتێك تەپ و تۆزەکە هەموو لایەکی تەنییەوە مانای وایە چەند کۆمەڵە کەسێك نێردراون تا داری سوتەمەنی کۆبکەنەوە. تەنکە تۆزو خۆڵێکی لەم لا و لەو لا ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە ئەو سوپایە خەریکی چادر هەڵدانن .

٢٤- ئـاخـاوتـن و گـفـتـوگـۆی خـاکی و برایانە هەروەها خێرا خۆ ئامادەکردن دوو ئاماژەن کە پێمان دەڵێن دوژمن لە سەروبەندی پێشڕەوی کردنە. گوتاری زبر و توند و تیژ و پێشڕەوی کردن هەرچەند وا پیشان دەدات کە دوژمن هێرش دەکات بەڵام هەر زوو دوژمن دەکشێتەوە.

٢٥-کاتێك گالیسکە بچووکەکان هێنرانەدەرەوە(لەناو لەشکرەکە) لە لاچەپەکان دانران. ئەمە نیشانەی ئەوەیە دوژمن خۆی بۆ شەڕ ئامادە دەکات.

٢٦-پێشنیازی ئاشتی بێ ئەوەی هیچ ڕێکەوتننامەیەکی باوەڕپێکراوی لەگەڵ بێت مانای ئەوەیە پیلانێکی نهێنی و خراپ لە گۆڕێدایە[٧].

٢٧-ئەگەر پشێوی و هاتوچۆ هەبوو هەروەها هەر سەربازەو بۆ شوێنی دیاریکراوی خۆی دەڕۆیشت مانای ڕۆژی ڕەش هات (شەڕ نزیک بۆتەوە).



٢٨-ئەگەر هەندێ سەرباز لەپێشڕەوی دابون و هەندێکی تریش لە پاشەکشە بون. (وریابە !) ئەمە فێڵ و فریودانە .

٢٩-هەر کاتێك سەربازان خۆیان بەسەر ڕمەکانیان شۆڕکردبۆوە مانای وایە وەختە لە برسان بمرن .

٣٠-ئەگەر ئاو کێشەکان یەکەمجار بە خۆیان ئاویان خواردەوە مانای وایە سوپاکە وەختە لە تینویەتیان بخنکێ.

٣١-ئەگەر دوژمن هەلێکی باشی بۆ ڕێککەوت و هیچ هەوڵێکی بۆ نەدا مانای وایە سەربازەکانیان ماندوو و شەکەتن.

٣٢-ئەگەر باڵندە لەهەر شوێنێك کۆ بونەوە مانای وایە ئەو شوێنە داگیر نەکراوە. هات و هەرا بەشەو ترس و شڵەژان دروست دەکات .

٣٣- هەراو هۆریا لەناو سەربازگەدا نیشانەی ئەوەیە ئەفسەری سوپا دەستەلاتێکی کەمی هەیە. ئەگەر ئالآ و بەیداغەکان ئەو لا ئەم لایان پێدەکرا مانای وایە یاخیبونێك خەریکە پەیدا ببێت. ئەگەر ئەفسەرانی سوپاکە تورەبن مانای وایە سەربازەکان ماندوو و هیلاکن.

٣٤-هەر کاتێك سوپایەك دانەوێڵە ( گەنم و جۆ و هتد ...) بداتە ئەسپەکانی و ئاژەڵیش (مەڕ و بزن و مانگا ...) بۆ چێشت لێنان سەر ببڕێ و هەر کاتێك سەربازان(دوژمن) تاوە و مەنجەڵیان لەسەر ئاگردانی سەربازگەکە دانەنا هەروەها نەدەچونەوە ناو چادرگە و

بنکەکانیان، دەبێت بزانیت ئەوان خۆیان یەکلاکردۆتەوە هەتا مردن هەر شەڕ بکەن [٨].

٣٥-هەر کاتێك بینیت سەربازەکانت لەگەڵ یەکتری خەریکی پستەپستن و سەر لەبن گوێ ی یەکتر دەنێن و بە نهێنی دەئاخڤن . مانای ئەوەیە ناڕەزایی لە نێوان پلەدار و ڕیزەکانی سوپا هەیە .

٣٦-زوو زوو بەخشینی پاداشت مانای وایە کە سامان و دەرامەتی دوژمن بەرەو کۆتایی دەچێت، زۆر سزادانیش [٩] کەشێکی پڕ لەتەنگی و ناخۆشی دروست دەکات.

٣٧-ئەو سەرکردەیەی کە بەهەڕەشە و گوڕەشە دەست پێدەکات پاشان لەبەر ژمارەی زۆری دوژمن ترسی لێدەنیشێت ئەوە نیشانەی ئەو پەڕی کەم بەهرەیی ئەو سەرکردەیە.

٣٨- لەکاتی ناردنی نێردراوی زمان لوس مانای وایە دوژمن حەزی لە ئاگر بەستە[١٠] .

٣٩- ئەگەر سەربازانی دوژمن هەر لە پێشڕەوی دابوون و بەردەوام بون لە ڕووبەڕووبونەوەی ئێمە بەبێ حەسانەوە و گەڕانەوە. ئەم بارودۆخە پێویستی بە هۆشیاری و وریایی هەیە.

٤٠- ئەگەر هێزی سەربازانی دوژمن لە هی ئێمە زیاتر بێت کێشە نییە هەر ئەوەندە هەیە نابێت هیچ هێرشێکی ڕاستەوخۆیان بکەینەسەر، ئەوەی ئێمە پێمان بکرێت ئەوەیە کە هەرچی هێزی هەمانە کۆیان بکەینەوە و چاو لەسەر دوژمن هەڵنەگرین و هەوڵی بەدەست هێنانی یارمەتی سەربازی (reinforcements) بدەین[١١] .

٤١- ئەو کەسەی پێش شەڕەکە نەکەوتبێتە خۆی نەخشەکەی دانانەبێت و بەشتێکی کەم لە دوژمن بڕوانێت بە دڵنیاییەوە ئەو کەسە لەلایەن دوژمنەوە بە دیل دەگیرێ.

٤٢-ئەگەر سەربازان پێش ئەوەی پابەند و پەیوەستی تۆ بن سزادران وایان لێدێت کە ملکەچ نەبن و ( فەرمانەکانت بشکێنن ) ئەگەر ناچاریش بون ملکەچ بن بە کردار گوێڕایەڵ نابن، خۆ ئەگەر سەربازان بەباشی پەیوەستی تۆ بون وترسی سزادانیشیان نەبو لەکاتی پێویست (شەڕ) سودیان نابێت[١٢] .

٤٣- لەبەرئەوە هەر لەسەرەتاوە دەبێت بە شێوەیەکی مرۆڤانە ڕەفتار لەگەڵ سەربازاندا بکرێت بەڵام دەبێت ئەو جۆرە ڕەفتارە لە

ژێر سایەی یاسایەکی پتەو و تۆکمەوە پەیڕەویی بکرێت ئەمە ڕێگا خاترجەمەکەی سەرکەوتنە .

٤٤- ئەگەر مەشق و ڕاهێنانی سەربازان بە پێی فرمانەکان بەڕێوەچوو ئەوا سوپایەکە بە تەواوی ڕێك و پێك دەبێت ئەگەر ئاواش نەبێت ڕێکخستنی سوپا زۆر خراپ دەبێت .

٤٥-ئەگەر سەرلەشکر متمانەی خۆی بۆ سەربازان نیشان بدات و سووریش بێت لەسەر جێبەجێ کردنی فرمانەکانی، سودی دوو لایەنەی دەبێت [١٣].



## بەکورتی، وەڵامی ئەو پرسیارانە مەغزی ئەم بەشەن:

١- چۆن مامەڵە لەگەڵ پێکهاتەی ڕووی زەوی بکەین؟ چۆن ڕەفتار بکەین لەگەڵ جوگرافیای سروشتی ناوچەکە تا بە تەواوی بەکەڵکی خۆمان بێت؟

٢- جۆرەکانی جموجۆڵ و ئامازەکانی چین ؟

٣- لە چ جۆرە سوپایەك بترسین ؟ بۆچی ؟

٤- سەرلەشکر چۆن مامەڵە لەگەڵ سەربازەکانی بکات ؟

تێبینی: بە گوێرەی دابەشکاری سون تزو دەبێت سوپا بکەینە چوار پەل و دەبێت هەر پەلێك سەرکۆمەری خۆی هەبێت و هەر چوار سەرکۆمەرەکەش لەلایەن سوپاسالارەوە سەرپەرشتی دەکرێن



## پەراوێزەکان:

١ ) چاودێریکردنی جموجوڵ و بزاوتی هێزی دوژمن هەر لەدوورەوە تاکو بارودۆخی ئەوان بزانین و شیتەڵی بکەین.

٢) نابێت لەشکر بەسەر بەرزاییاندا تێپەر بێت چونکە سەرچاوەی ئاو و خۆراکی کەمە بەڵکو لەلێواری دۆڵان ئەم مەبەستە دێتەجێ.

٣) مەبەست لە شوێنی بەرز لوتکەی شاخان نییە بەڵکو مەبەست سەرگرد و تەپۆلکەیە.

٤) چونکە ئاوی سازگاری نییە و بەزۆریش بەرئاوی سوێر گۆڕاییە و تەختاییە دوژمن بەئاسانی دەتوانێت زەفەرت پێ ببات.

٥) لە سالآنی ٧٢٢-٤٧٦پ.ز فەرمانڕەواییی کردووە.

٦) مەبەستمان لەشوێنی تەندروست ناوچەیەکی وشك و خۆشە کە نەخۆشی تێدا بڵاو نابێتەوە نەك ناوچەیەکی شێدارو پیس کە بەهۆیەوە سەربازەکان نەخۆش دەکەون.

٧) ڕێککەوتن دەبێت بە بەڵگەنامەی مۆرکراو بێت هەروەها گەرەنتی پابەندبوونی هەردوو لای لەگەڵ بێت.

٨) ئەو دوو کارە نیشانەی بارێکی نائاسایین چونکە لەکاتی ئاسایی ئەسپ و ولآغ گژوگیا دەخۆن و سەربازانیش دانەوێڵە دەخۆن لێ ئەگەر سەرباز تەمای گەڕانەوەی نەبێت هەرچی لایەتی هەموی دەرخواردی خۆی و ئەسپەکانی دەدات .

٩) ئەگەر سوپایەك گەمارۆ بدرێت سەر لەشکر زوو زوو خەلآت و بەخشیش دەبەخشێتە سەربازەکانی هەتا خۆ ڕاگرین و ترسیان

بڕەوێتەوە و بیر لە یاخی بوون نەکەنەوە. ئەگەر سزادانیش  پتر بوو ترس و ناڕەحەتی دڵی سەربازان دەکاتە ئاو .

١٠) ناردنی نێردراو مانای وایە دوژمن کزبووە و هێزی لەبەر بڕاوە بۆیە ئاگر بەستی دەوێت .

١١) reinforcements واتە :

سەرباز و چەك و کەرەستەی جەنگی تازەی نێردراو بۆ بنکەی سوپایی یا مەیدانی جەنگ بۆ بەهێزکردنی ئەو لەشکرەی لەوێیە .

١٢) واتە : ئەگەر سەرباز و سەر لەشکر بونە برادەر و ترسیان نەما ئەو سەربازانە بە کەڵکی شەڕێ نایەن .

١٣) ملکەچی سەربازان لە هەمبەر فرمانەکانی ئەو ئەفسەرە ، متمانەی سەربازان بە ئەفسەرەکەیان.



دەستنوسێکی کۆن بە نیشانەی چینی

# بەشی دەیەم

## بەرزو نزمی ڕووی زەوی




١-سون تزو وتویەتی: دەتوانین ڕووکاری زەوی بۆ شەشە بەش دابەش بکەین:

١) ناوچەی بەردەست [١]

٢) ناوچەی پڕ مەترسی [٢]

٣) ئەو ناوچانەی بەدوات دەخەن ( تەئخیرت دەکەن ) [٣]

٤) ڕێچکە تەنگەبەرەکان

٥) بەرزاییە زۆر لێژەکان

٦) شوێنی زۆر دوور له دوژمن

٢- ئەو ناوچانەی کە هەردوو لایەنی شەڕەکە دەتوانن بەئاسانی پێیدا گوزەر بکەن پێیدەوترێت: ناوچەی بەردەست.

٣- سەبارەت بەسروشتی ئەو ناوچانەوە، دەبێت تۆ پێش دوژمن ئەو ناوچانە داگیر بکەی کە بەرز و بەرتاون. بە وردی و وریایی پارێزگاری لەو ڕێیە بکە کە لێیەوە یارمەتیت پێدەگات. ئەوجا دەتوانین شەڕ بکەین و پارسەنگی هێز بەلای تۆوە دەبێت .

٤-ئەو ناوچانەی کەبە ئاسانی دەتوانین دەستیان لێ هەڵبگرین و چۆلیان بکەین بەڵام بە سەختی دەتوانین دەستیان بە سەر دا بگرینەوە پێیان دەوترێت ناوچەی پڕ مەترسی.

٥- لەم چەشنە شوێنانەدا، ئەگەر دوژمن خۆی ئامادەنەکردبوو، دەتوانیت یەکسەر هێرش بکەیتە سەر دوژمن و بیشکێنی. بەڵام ئەگەر دوژمن خۆی بۆ هاتنت ئامادەکرد بوو ئەوا تۆ ناتوانیت شکست بەو دوژمنە بهێنیت. دوای ئەوە بە هیچ شێوەیەك ناتوانی پاشەکشێ بکەیت و بەڵایەکی ناگەهان یەخەت پێدەگرێ.

٦- ئەگەر شوێنەکە لەم چەشنە بوو هیچ کام لە دوو لایەنەکە، لە پێشڕەوی یەکەم ناتوانن داگیری بکەن واتە ئەو ناوچانەی کە بەدوات دەخەن =الأرضي المعوقية[٤] Temporized ground .

٧- لەم جۆرە شوێنانەدا، هەرچەندە دوژمن بیەوێت فێڵێکی سەرەنجڕاکێشمان لێبکات [٥] کەچی وا باشترە پێشڕەوی نەکەین، بەڵکو پاشەکشەبکەین. بەمشێوەیە بۆ هەڵفریواندنی دوژمن تاوەکو بەشێك لە سوپاکەی هەنگاو بەرەو پێش بنێن ئەوجا کاتی گونجاوی هێرشی ئێمە دێتە پێشەوە و پارسەنگی هێز بەلای ئێمە دەکەوێت .

٨-دەربارەی ڕێچکە تەنگەبەرەکان ، ئەگەر توانیت هەر زوو دەستیان بەسەردا بگریت ئەوا بەو پەڕی هێزەوە بیانپارێزە و چاوەڕوانی هاتنی دوژمن بکە .

٩-ئەگەر دوژمن دەست پێشخەری کرد لە داگیرکردنی ڕێچکەیەك و ئەو ڕێچکەیەش سەربازی لێبوو بەدوایاندا مەچوو بەڵام ئەگەر باش نەپارێزرا بوو بەو ڕێچکەیەدا برۆ و سەریان لە دوو بنێ .

١٠- سەبارەت بە بەرزاییە لێژەکان، ئەگەر تۆ بە پێش دوژمن کەوتبویەوە،لەسەرت پێویستە شوێنە بەرز و بەرتاوەکان داگیربکەی و چاوەڕوانی هاتنی دوژمن بکەیت [٦].

١١-ئەگەر دوژمن لە پـێـشـی تـۆ (بەرزاییە لێژەکانی)داگیرکردبوو بەدوایاندا مەڕۆ بەڵکو پاشەکشە بکە و لە هەوڵی ئەوەدابە فریویان بدەیت (تا بێنە خوارەوە ) .

١٢-ئەگەر زۆر لە دوژمن دوور بووی، هێزی هەردوو لاتان پارسەنگ بوو، ئاسان نییە شەڕ بە دوژمن بفرۆشی و هانیان بدەی، لەم حاڵەتەدا شەڕ لە سودی تۆدا نییە.

١٣-ئەو شەش بنەمایە پەیوەستن بە ڕووکاری زەوییەوە. ئەو سەرکردەیەی کە بەرپرسیاریەتی لە ئەستۆدایە لەسەری پێویستە بەجوانی تاوتوێیان بکات .

١٤-ئێستاش (دێینە سەر باسی) شەش بەڵای تر کە مەترسیان لێدەکرێت توشی سوپا ببن کە لە هۆکارە سروشتییەکان پەیدا نابن بەڵکو لەو هەڵانە سەرچاوە دەگرن کە سەرکردە لێیان بەرپرسیارە، هەڵەکانیش ئەمانەن :

١.ڕاکردن، هەڵاتن

٢. یاخی بوون

٣. هەرەس هێنان (لەبەر بێ ورەیی )

٤. ڕوخان و فەوتان

٥. بێ سەرو بەری

٦. بەپەلە کشانەوە لە مەیدانی شەڕ (خراپ شکان=Rout)

١٥- ئەگەر هێزێكی سەربازی لەگەڵ هێزێكی تری دە هێندەی خۆی كەوتە شەڕەوە. لە ئەنجامدا هەر ئەو هێزەی یەكەم دەدۆڕێ و ڕادەكات ( كە یەكێك لەو كێشانەی سەرەوەی هەبێت ).

١٦-ئەگەر سەربازە ئاسایییەكان زۆریش بەهێز بن بەڵام ئەفسەرەكانیان لاواز و بێ تین بن ئەوا سەربازەكانیان یاخی دەبن. بەڵام كاتێك ئەفسەرەكان زۆر بەهێز بن و سەربازە ئاساییەكانیش زۆر لاواز بن ئەو لەشكرە هەرەس دێنێت(٧) .

١٧-ئەگەر ئەفسەرە باڵاكان زۆر تورە و یاخی بوون. لەكاتی ڕووبەڕووبونەوەی دوژمن یەكەم كەس ئەوان دەست بە ملنەدان دەكەن، بەرك و كینەوە بە كەیفی خۆیان شەڕ دەكەن، پێشی ئەوەی سەركردەی گشتی سوپا فرمان بە دەست پێكردنی شەڕبكات. ئەنجامی ئەو سوپایەش ڕوخان و فەوتانە .

١٨-كاتێك سەركردەی سوپا لاواز بوو، دەستەڵاتیشی كەم بۆوە و فەرمانەكانی ڕوون و ئاشكرا نەبوون، وە لە كاتی نەبونی ئەركی دیاریكراو بۆ ئەفسەران و سەربازەكانی، هەروەها لە كاتی بەخشینی پلە سەربازییەكان بە شێوەیەكی لەخۆو هەڕەمەكی، لە ئەنجامدا بێسەر و بەریەكی تەواو لەو سوپایە ڕوودەدات .

١٩-كاتێك سەركردە نەتوانێت هێزی دوژمن بخەملێنێت، هێزێكی كەم و ناتەوان بەگژ هێزێكی گەورەو گران وەبنێ، دەستەیەك سەرباز

ڕووبەڕووی دەستەیەکی بەهێزتر بکات. جەنگاوەرە پاڵەوانەکان لە ڕیزی پێشەوە دانەنێ ئەنجامی ئەو سوپایە پاشەکشە و شکانە [٨].

٢٠- ئەمانە ئەوحەوت ڕێگەیەن کە بەرەو شکست و هەرەست دەبەن. ئەو سەرکردەیەی کە بەرپرسیاریەتی لە ئەستۆ گرتووە لەسەری پێویستە زۆر بە وریایی شرۆڤەیان بکات .

٢١- ڕێکوپێکی وڵات باشترین پشت و پەنای سەربازە. ئەمانە سیفەتی سەرکردەی مەزنن: توانای مەزەندە کردنی هێزی دوژمن، بەردەستکردنی هۆیەکانی سەرکەوتن بە زیرەکی وچاپوکی خۆی، خەملاندنی مەترسی و دووری نێوان دوو سوپاکە.

٢٢- ئەو کەسەی ئەو شتانە دەزانێت و لەشەڕدا ئەو زانیاریانە دەکاتە کردار سەردەکەوێت. بەڵام ئەو کەسەی کە ئەم زانیاریانەی نەبێت و کاریشیان پێنەکات هەر بە دڵنیا ییەوە دەشکێت .

٢٣-ئەگەر(بۆت دەرکەوت) بەر ئەنجامی شەڕەکە هەر سەرکەوتنە ئیدی لەسەرت پێویستە شەڕەکە تەواو بکەیت تەنانەت ئەگەر پاشاش پێشگیریت لێبکات. ئەگەر (دڵنیابویت) لەشەڕەکە شکست دەهێنیت لەسەرت پێویستە دەست هەڵبگری و شەڕ نەکەی خۆ ئەگەر فەرمانی پاشاشی لەسەر بێت .

٢٤- ئەو سەرکردەی کە پێشڕەوی دەکات بە بێ ئەوەی حەزی لە ناوبانگ بێت وبێ ئەوەی ترسی لە ئابڕوچونی خۆی هەبێت

پاشەکشێ دەکات، هەروەها ئەو سەرکردەیەی تەنها بیر و هزری لەسەر ئەوەیە کە ولاتەکەی خۆی بپارێزی و خزمەتی پاشایەکەی خۆی بکات، ئەو سەرکردەیە گەوهەری بەهاداری شانشینەکەیەتی.

٢٥- وەکو منداڵەکانی خۆت سەیری سەربازەکانت بکە. ئەوجا ئەوانیش لە دوات نابنەوە ئەگەر بچیتە ناو قوڵترین دۆڵ. وەکو خۆشەویستترین کوڕی خۆت سەیریان بکە، ئەوجا ئەوانیش هەتا ڕوحیان لەبەردا بێت لەگەڵت دەبن.

٢٦- بەهەر حاڵ ئەگەر تۆ بەخشندە بوویت و سەربازەکانیشت سنوری دەسەلاتی تۆیان نەزانی، ئەگەر تۆ دڵنەرم بویت و نەتدەتوانی فەرمانەکانی خۆت بە زۆر بسەپێنی.توانات نەبوو ئاژاوە و کێشمە کێشم دابمرکێنێتەوە، سەربازەکانت دەبنە منداڵی بەناز و بە کەڵکی ئیشی پیاوان نایەن.

٢٧- ئەگەر بزانین سەربازەکانمان ئامادەی هێرش بردنن وئاگاشمان لەوە نەبوو دوژمن لاوازە ئەو کاتە نیوەی ڕێگای سەرکەوتنمان بڕیووە.

٢٨- ئەگەر زانیمان دوژمن لاوازە و بێ ئاگاش بوین لەوەی کە سەربازەکانمان ئامادەی حاڵەتی شەڕ نین بە هەمان شێوە تەنها نیوەی ڕێی سەرکەوتنمان بڕیوە.

٢٩-ئەگەر سوپای دوژمن درزی تێکەوتبوو، سەربازەکانی ئێمەش ئامادەی هێرش بوون بەڵام شارەزای ڕووکاری سروشتی زەوی نەبوون هێشتا شەڕ لە سودی ئێمەدا نییە و نیوەی هەلی سەرکەوتنمان هەیە.

٣٠-بەم شێوەیە سەربازی بە ئەزمون هەتا نەکەوێتە ناو شەڕێ سەری لێ ناشێوێ و ناحەپەسێ. هەتا سەربازگەکەی بەجێنەهێلێت و بەرەو شەڕ نەچێت هیچ زەرەرێك ناکات.

٣١-لێرەدا وتەیەکی بەپێز هەیە دەڵێت: ئەگەر خۆت و دوژمنەکەت ناسی گومانت لە سەرکەوتن نەبێت، ئەگەر ئاگات لە ئاسمان (ئاو و هەوا) و زەوی (مەیدانی شەڕ) هەبوو ئەوا سەرکەوتن بە تەواوی بۆ تۆیە.

## بژارەی بەشی دەیەم:

ئەم بەشە باسی پێکهاتەی ڕووی زەوی دەکات (لە بەندی ١ - ١٣). پاشان دێتە سەرباسی ئەو شەش بەڵایەی  کە توشی لەشکر دەبن (لە بەندی ١٤ - ٢٠). بەندەکانی دوایی تا کۆتایی هەندێ ئامۆژگاری جۆراوجۆر لە خۆ دەگرێت.

پەراوێزەکان:

١)  ناوچەی بەردەست: ئەو ناوچانەن کە ڕێ و ڕێبازیان هەیە و گواستنەوە و گەیاندن بە ئاسانی تێیاندا ئەنجام دەدرێ.

٢)  ئەو ناوچانەن کە پڕن لەتەڵەکە و داوی دوژمن، بۆسە و شارگەی زۆری تێدا دانراوە.

٣) ئەو ناوچانەن کە چڕو پڕن و بەربەستی زۆریان تێدایە کە دەبنە لەمپەر لە هەمبەر زوو تێپەڕبون پێیاندا .

٤) هیچ کام لە دوو لایەنەکە ناتوانن ناوچەی پڕ مەترسی داگیر بکەن؟ چونکە هەر یەکێکیان چاوەڕێی هەنگاو نانی لایەنەکەی تر بەمجۆرە هەردوو لایەن جوڵە ناکەن و کاتێکی زۆر بە فیڕۆ دەڕوات .

٥) فێڵی سەیر ئەوەیە کە دوژمن وا پیشان دەدات کە پاشەکشێ دەکات بەڵام بەس بۆ فێڵ و چەواشە وادەکات .

٦) داگیرکردنی بەرزاییە لێژەکان زۆر سەختە و زۆریش بەسودە، بۆچی سەختە؟ چونکە بە ئاسانی ناتوانیت داگیریان بکەی هەتا نەخشە پلانی دوژمن نەزانیت. هەروەها زۆر بەسودە؟ چونکە ڕێی قەدپاڵان دەڕوانێتە نزمەلان و بەئاسانی دەتوانیت لە دوژمن بڕوانیت.

٧) ئەفسەری بەهێز زۆر پاڵەپەستۆ دەخاتە سەر سەربازی بێ هێز تا پێشڕەوی بکات. خۆ ئەو جۆرە سەبازانەش ناتوانن هەنگاو بنێن لەوانەیە هەر نەوێرن تا وایان لێ دێت وەکو مێگەل ڕادەکەن و بەلبەلەیەك دروست دەکەن .

٨)ئەگەر جەنگاوەرە پاڵەوانەکان لە ڕیزی پێشەوەی سوپا دابنێیت ورەی سەربازان بەرز دەبێتەوە و هێزی دڵی سەربازانی دوژمن لەکەمی دەدات .



# بەشی یازدەهەم

## نۆ هەرێم [1]




١-سون تزو وتویەتی: هونەری شەڕ نۆ جۆر هەرێمی جیاواز دەستنیشان دەکات:

١-هەرێمی بەرهەڵا

٢- هەرێمی گونجاو و ئاسان

٣-هەرێمی بەکێشە و بەڵا

٤- هەرێمی کراوە

٥- هەرێمی ڕێیی خێرای یەکتربڕ

٦- هەرێمی مەترسیدار

٧- هەرێمی سەخت

٨- هەرێمی دەوردراو

٩- هەرێمی بێ هیوایی

٢-ئەگەر سەرکردە لەسەر خاکی خۆی و لە هەرێمی خۆیدا شەڕ بکات ئەوە لە هەرێمی بەرهەلاّ شەڕ دەکات [٢] .

٣-کاتێك سەرکردە هەندێ چۆتە ناو خاکی دوژمن بەلاّم زۆر بڕی نەکردووە بەشوێنی ئەو شەڕە دەوترێت: هەرێمی گونجاو و ئاسان[٣]

٤-ئەو ناوچەی کە لە سودی هەردوو لایەنی شەڕەکە هەڵکەوتووە هەرێمێکی بە کێشەو بەلاّیە .

٥- ئەو شوێنەی کە هەردوو سوپا بە ئاسانی دەتوانن تێیدا جموجۆڵ بکەن هەرێمی کراوەیە .

٦-هەرێمی ڕێی بەیەکگەیشتوو : ئەو ناوچەیە یە کە ڕێی سێ ولاّتی تخوب (هاوسنور) پـێیدا تێپەر دەبێت لەبەرئەوە ئەو کەسەی کە یەکەمین جار دەست بەسەر ئەو هەرێمەدا بگرێ ئەوا بەشی زۆری ولاّتەکە بۆ خۆی داگیر دەکات .

٧-كاتێك سوپایەك لەناو جەرگەی وڵاتی دوژمن، چەندەها شاری بەهێز و پتەوی لە دوای خۆی بەجێهێشت (و داگیری نەکردن) بەو هەرێمە دەڵێن هەرێمی مەترسیدار [٤].

٨- ناوچەی دارستانی شاخاوی، هەوراز و نشێوی سەخت، زەلکاو و زۆنگاو – هەروەها هەر شوێنێکی وڵات کە گەڕان و سوڕان تێیدا زەحمەت و ناخۆش بێت پێی دەوترێت هەرێمی سەخت.

٩- ئەو ناوچانەی کە تەنها لە ڕێچکە و تەنگەبەرەوە دەتوانین بیانگەیتێ. هەروەها تەنها لە ڕێچکەی پێچاوپێچەوە دەتوانین پاشەکشە بکەین، بەجۆرێك کە دوژمن بە ژمارەیەکی کەمی سەربازان بتوانێت زۆربەی سوپاکەی ئێمە هەرەس پێبهێنێت، پێی دەوترێت هەرێمی دەوردراو.

١٠- هەرێمی بێ هیوایی ئەو ناوچەیە کە دوای شەڕێکی گران و بێ دواکەوتن دەتوانین لێی دەرباز ببین .

١١- لە هەرێمی بەرهەڵادا شەڕ مەکە. لە هەرێمی گونجاو و ئاسان ڕامەوەستە. لە هەرێمی بە کێشە و بێشەدا هێرش مەکە.

١٢- لە هەرێمی کراوەدا ڕێگەی دوژمن مەگرە. لە هەرێمی ڕێی یەکتربڕ لەگەڵ هاوپەیمانان دەست تێکەڵ بکە.

١٣- له هەرێمی مەترسیداردا تالآنی و دەستکەوت کۆبکەوە[٥]. له هەرێمی سەختدا بەردەوام به له ڕۆیشتن .

١٤- له هەرێمی دەوردراو دەبێت پەنا ببەیته بەر فرت و فێڵ. له هەرێمی بێ هیواییدا شەڕ بکه[٦].

١٥- لەسەردەمانی زوو ئەو کەسانەی کارامه و زیرەك بون دەیانزانی چۆن پێشەنگ و پاشڕەوی سوپای دوژمن لەیەکتری دابڕن، تاکو یەکه گەورە و بچوکەکانی سوپا له یارمەتی یەکتردا نەبن، تا سەربازه پاڵەوانەکان نەتوانن سەربازه لاواز و بەزۆر هێنراوەکان ڕزگار بکەن. هەروەها نەیاندەهێشت ئەفسەرەکان سەربازانی خۆیان کۆبکەنەوە.

١٦- خۆ ئەگەر سەربازانی دوژمن یەکگرتوو بان ئەوا (سەرکردەکانی پێشان) دەیانتوانی ئاژاوەیان له ناو دروست بکەن.

١٧- ئەگەر پێشڕەوی له سود و کەڵکی ئەواندا بوایه پێشڕەوییان دەکرد. لێ ئەگەر وا نەبوایه هەر له جێی خۆیان جوڵەیان نەدەکرد .

١٨-ئەگەر یەکێ پرسیار بکات ! چۆن ڕەفتار لەگەڵ سوپایەکی مەزنی دوژمن بکەین که ڕیزه تۆکمەکانیان واخەریکه هێرش دەکەن؟ منیش دەڵێم: گەمارۆی ئەو شته بده که دوژمن زۆر به گرینگی دەزانێت ئەوجا دوژمنیش بەخۆی دەکەوێته بن دەستی تۆ و گوێڕایەڵی داخوازییەکانی تۆ دەبێت.

١٩-خێرایی بنچینەی سەرەکی شەڕە. سود لە نائامادەیی دوژمن وەربگرە. ڕێگەیەکی ئاوا بگرە بەر کە هەرگیز پێشبینی نەکرابێت. لەو شوێنەوە هێرش بکە کە پاسەوانی نەبێت .

٢٠- ئەمانەی خوارەوە هەندێ بنەمان کە پێویستە هەموو هێزێکی شەڕکەر بە گرینگیەوە لێیان بڕوانن. هەرچەندە هێزەکانی تۆ بۆ ناو جەرگەی وڵاتی دوژمن لە پێشڕەوی دابن ئەوەندە زیاتر سەربازەکانت یەکگرتوو و یەك دەست دەبن. ئا بەم شێوەیە دوژمنان ناتوانن لە دژی تۆدا بەرەڤانی بکەن .

٢١- ئەو شوێنانە داگیر بکە کە بە پیت و بەرهەمن تاکو خواردنی سوپاکەت مسۆگەر بکەیت.

٢٢- ئاگاداربە ! لە(ژیان) خۆشی و ئاسودەیی سەربازەکانت بکۆڵەوە[٧]. لە توانای خۆیان زیاتر ئەرکیان پێمەسپێرە. تین و وزەی خۆت کۆبکەوە و هێزو توانای خۆت بۆ ( ڕۆژی ڕەش ) هەڵبگرە. بە بەردەوامی جوڵە بە سوپاکەت بکە و نەخشە و پلانی ئەوها دابنێ (شەیتانیش سەری لێدەرناکا) شاراوە بن و کەس لێی تێنەگا.

٢٣- سەربازەکانت بخەرە شوێنێکی ئاوا کە نەتوانن پشت هەڵکەن و ڕاکەن با مردنیان لە هەڵاتن لا چاتر بێت. ئەگەر سەربازەکانت ڕووبەڕووی مردن بونەوە دەشێ هەموو جۆرە

سەرکەوتنێك بەدەست بهێنن. ئەو کاتە ئەفسەران و سەربازانیش ئەو پەڕی توانای خۆیان دەخەنە کار .

٢٤- سەرباز لەکاتی نائومێدیدا هەست بەترس ناکات، ئەگەر هیچ شوێنێ بۆ ڕاکردن نەبێت. ئەوجا سەربازەکان لە شوێنەکانی خۆیان چەسپاو دەبن و ڕاناکەن. ئەگەر سەربازان لە ولاّتی دوژمن بوون ئەوا ڕیزەکانیان بە پتەوی نیشان دەدەن خۆ ئەگەر هیچ یارمەتیشیان بۆ نەچێت ئەوا هەر بەجدی شەڕ دەکەن .

٢٥- بەمشێوەیە(سەربازان) بێ ئەوەی چاوەڕوانی فرمان پێکردن بن ئامادەن گیانی خۆیان ببەخشن.بێ پێوتن داخوازی و ویستەکانت جێبەجێ دەکەن بە بێ هیچ دوو دلّییەك، دلّسۆز و وەفادار دەبن.بەم شێوەیە دەتوانرێت بڕوایان پێبکرێت .

٢٦- مەهێلّە هەوالّی خراپ بلاّوببێتەوە، هەموو گومانێکی پڕوپوچ وەلا بنێ تا ئەو کاتەی مردن بە خۆی دێت، پێویست ناکات لە هیچ کارەساتێك بترسین[٨] .

٢٧- ئەگەر سەربازەکانت زۆر گوێ بە پارەوپول نادەن مانای ئەوە نییە حەزیان لە دەولّەمەندی نییە. ئەگەر تەمەنیان کورتە و زۆر نازێین لەبەرئەوە نییە مەیلیان لە ژیانێکی درێژ نییە[٩].

٢٨- لەو ڕۆژەی کە فرمانی شەڕ دەردەچێت لەوانەیە سەربازەکانت دەست بە گریان بکەن، ئا لەو کاتەی سەربازەکانت

فرمێسکەکانیان دەوەرێنن و بەسەر گۆنایاندا دێتە خوارێ هەتا جل و بەرگیان تەڕ دەبێ[10]، لێ لە مەیدانی شەڕێ ببینە چۆن وەکو چوان چوو و تساو کوێی[11] مەردایەتی و ئازایەتی پیشان دەدەن.

٢٩-ئۆینبازی کارامە هەر لەماری شوای جان[12] دەچێت . شوای جان جۆرە مارێکە لە چیاکانی شانج هەیە . کەتۆ دەتەوێت سەری پان بکەیتەوە ئەو بە کلکی پەلامارت دەدا ئەگەر تۆ لەکلکی بدەی ئەو بەسەری پەلامارت دەدات. تۆ لەکەمەری بدە،ئەو بەسەر و کلکی پەلامارت دەدات .

٣٠-ئەگەر پرسیارم لێبکەیت ئەرێ ئێمەش دەتوانین سوپاکەمان وەکو ماری شوای جان لێبکەین؟ پێت دەڵێم : بەڵێ چونکە ئەگەر سەربازانی وو سەربازانی یوو کە دوژمنی یەکترن بەهەمان کەشتی لە ڕووبارێك بپەڕنەوە توشی زریان و گێژەلوکە بوون هەندێکیان دەستی یارمەتی بۆ هەندێکی تریان درێژ دەکەن وەکو چۆن دەستی چەپ یارمەتی دەستی ڕاست دەدات[13] .



٣١- بەستنەوەی ئەسپەکان بەس نییە تا متمانە بکەین کە هەڵنایەن لە قوڕ چەقاندنی چەرخەی گالیسکەکانیش بەس نییە بۆ دڵنیاییمان کە سەربازەکانمان ڕاناکەن [١٤].



٣٢-بۆ سەرپەرشتی سوپایەك بنچینەیەك هەیە ئەویش ئەوەیە کە ستانداردێکی ئازایەتی وا دابنێی کە زۆربەی ( سەربازانی سوپاکە) پێویستە بیگەنێ .

٣٣- چۆن دەتوانین ئەوپەڕی سود لە بەهێز و لاواز وەربگرین ؟ باش مامەڵەکردن لەو هەرێمەی کە تێیدای ئەو پرسە یەکلایی دەکاتەوە [١٥].

٣٤- سوپاسالاری کارامە بــە جۆرێ سـەرپەرشـتی سـوپـاکـەی دەکات وەك بلێی تاکە سەربازێکە لەبەر دەستی خۆیەتی دەتوانێ جولەیان پێبکات جا بیەوێ یان نەیەوێ.

٣٥- کاری سوپاسالار ئەوەیە کە دەبێت هێمن و لەسەرخۆ بێت و نهێنییەکانی خۆی بپارێزێ.هـەروەهـا کـەسێکی بـەشـەرەف و سەر ڕاست و دادپەروەر بێت. ئابەم جۆرە دەتوانێ یەکێتی ڕیزەکانی بپارێزێ .

٣٦- لـەسـەر(سـوپـاسالار) پێویستە ئەفسەران و سەربازەکان بە ڕاپۆرتی هەڵە وشتی ڕواڵەتی سەرسام بکات ئا بەم شێوەیە بیانخاتە بێئاگاییەکی تەواو[١٦] .

٣٧- (سـوپـاسـالاری ژیـر) بـەهـۆی گـۆڕانـکـاری لـە ڕێـکخستن وپلانەکانی[١٧] وا لـە دوژمـن دەکـات کـە هـەرگـیـز زانـیـاری تەواوی بەردەست نەبێت. ڕاگواستنی بنکە سەربازیەکان و گرتنەبەری ڕێی بە پێچ و پـەنـا وا لە دوژمـن دەکات کە نـەتـوانێت پـێشـبـیـنـی مەبەستەکانی ئەو (سەرلەشکرە) بکات.

٣٨- لەکـاتـی نـاخـۆشـی و نـەهـامـەتـی دەبێـت سوپاسالار وەکو کەسێك ڕەفتار بکات کە بە بەرزاییەك سەرکەوتووە دواتر پەیژەکەی وەلاناوە هەروەهـا سەربازەکانـیـش بباتە ناو جەرگەی وڵاتی دوژمن پێش ئەوەی دەستەکەی خۆی ئاشکرا بکات[١٨] .

٣٩- لەو کاتـە نـەگبـەتـەدا بـەلەمەکان دەسوتێنیت و تـاوە و هیربارەکان تێك و پێك دەشکێنێت وەکو شوانێك کە مێگەلە مەڕێك ڕادەدات ئەوها سەربازەکانی بەپێشە خۆی بدات بێ ئەوەی کەس بزانێت ئاخۆ بۆ کوێ دەڕۆن؟



٤٠- هـەر لە کـارەکـانی سـوپـاسـالار ئـەوەیـە کـە سەربازەکانی کۆبکاتەوە وبەجوانی ڕیزیان بکات تا بەرەنگاری دوژمنیان بکات.(١٩)

٤١- پـێـوانـە هـەمـەچـەشـنـەکـان لـەگـەڵ نـۆ هەرێمەکەی زەوی گونجاون.ئاخۆ باری تاکتیکی هێرش بردن یان بەرگری تا چ ڕادەیەك گونجاوە؟ هەروەها یاسا بنجییەکانی سروشتی مرۆڤ. ئەو شتانە ئەوە دەهێنن گفتوگۆیان لە بارەوە بکرێت.

٤٢- لەو کاتەیدا کە کەوتیتە ناو خاکی دوژمن (وڵاتی دوژمنت داگیر کرد) یاسای گشتی سەربازی دەڵێت: هەتا ناوجەرگەی وڵاتەکە ڕامەوەستە چونکە یەکێتی ڕیزەکانی سوپاکەت پتەوتر دەبێت بەڵام ئەگەر هەر تۆزی وڵاتی دوژمنت لێ بنیشێت و هیچی تر ئەوا باوك کوڕی خۆی لە ناو سوپاکەت ناناسێتەوە.

٤٣- ئەگەر لەنیشتمانەکەی خۆت دوور کەوتیتـەوە و سوپاکەت لەخاکی خۆیدا نەما ئەوا تۆ کەوتـیتە ناو هەرێمی شلۆق[٢٠]. ئەگەر لە هەر چوار لاوە ڕێگای پەیوەندی هەبوو ئەوا تۆ لە هەرێمی ڕێگەی خێرای یەکتربڕدایت.

٤٤- کاتێك پێشرەوی تۆ گەیشتە ناوجەرگەی وڵاتێك ئەوا تۆ لە هەرێمی مەترسیدار دایت. لەو کاتەی هەر بڕۆکەك ڕێت تەی کردبێت (بۆ ناو خاکی دوژمن) ئەو شوێنە هەرێمی گونجاو و ئاسانە.

٤٥-ئەگەر کەلاتی دوژمن کەوتبووە پشتی سوپاکەت و ڕێچکەی تەنگەبەریشـت لە پـێش بـوون ئـەوا تـۆ لە هەرێمی دەورەدراو دایت، ئەگـەر هیـچ شوێـنـێکت بۆ داڵدە و پەنا نـەبێت ئـەوا هـەرێمی بێ هیواییە.

٤٦- هەر بۆیە لە هەرێمی بێ هیوایی سەربازەکان هاندەدەم و بە یەك هەڵوێست دەیانخـەمـە جوڵەوە. دەبـێت لـە هەرێـمی گونـجـاو و

ئاسان پێداگیری لەسەر پەیوەندی پتەو بکەمەوە لەنێوان هەموو یەکە و دەستەکانی (ڕاست، چەپ) سوپاکەم.

٤٧- لەهەرێمی بەکێشە و بەڵا پەلەپەل لە پاشڕەوی سوپاکەم دەکەم[٢١].

٤٨- لە هەرێمی کراوەدا چاوێکم هەر لەبەرەڤانییە. لە هەرێمی یەکتر بڕو خێرا لەگەڵ (هاوسنوران) هاوپەیمانی وڕێکەوتنەکانم بەهێزدەکەم.

٤٩- لە هەرێمی مەترسیداردا هەوڵدەدەم بەتەواوی لەو ڕێیە دڵنیابم ( کە ڕیگایەکە ناگیرێت )کە ئازوخەی لێیەوە پێدەگات. لە هەرێمی سەختدا بەردەوام دەبم لەڕۆیشتن بە ڕێگەدا.

٥٠- لە هەرێمی دەوردراو هەموو ڕێیەکی پاشەکشێ دەگرم[٢٢]. لەهەرێمی بێ هیواییدا بەسەربازەکانم ڕادەگەیەنم بێ ئومێد بن لەژیان و هەوڵی ڕزگاربوون نەدەن.

٥١- هەر سروشتی سەرباز وایە ئەوپەڕی توانای خۆی دەخاتە گەر کاتێك گەمارۆی درابێت. لەوکاتەی دەستەوەستانە لە یارمەتی خۆی، زۆر بەتوندی دەجەنگێت.هەرکە(سەرباز)کەوتە ناومەترسیەوە بێ یەك ودوو گوێڕایەڵ و ملکەچ دەبێت.

٥٢-نابێت هاوپەیمانی لەگەڵ ئەو میرانەی هاو سنور بکەین هەتا بەتەواوی شارەزای پلان و مەبەستەکانیان نەبین.ئێمە هەرگیز بۆ سەرکردایەتی سوپایەك ناشێین هەتا ئاشنای ڕوکاری (سروشتی) وڵاتەکە نەبین. هەر بەشاخ وداخ و دارستان و چاڵ وچۆڵ و هەورازو نشێو زەلکاو و زۆنگاوەوە. ناتوانین ئەو بارە سروشتییەش بۆ کەلکی خۆمان بەکار بهێنین هەتا چاوساغی ناوچەکە ڕێبەریمان نەکەن.



٥٣-نابێت سەرکردەی سوپا هیچ کام لەوچوار پێنج بنەمایانەی خوارەوە پشت گوێ بخات.

٥٤-کاتێك سەر لەشکرێك هێرش دەکاتە سەر وڵاتێکی بەهێز، سەرکردایەتی و مەردایەتی ئەو سەرلەشکرە وەها خۆی دەردەخات کە هێزی دوژمن فرسەتی گردبونەوەی نەبێت. تۆوی ترس لە دڵی

دوژمن و هاوپەیمانەکانیش دەچێنێت و ناهێڵێت یەکبگرن لە دژی ئەو[٢٣].

٥٥-(سەرلەشکر)نابێت بەتەنگ ئەوە بێت کە هاوپەیمانی لەگەڵ هەموو چەشنە وڵاتێك ببەستێت نە خەریکی ئەوەیە وڵاتانی تر بەهێز بکات.ئەو سەر لەشکرە خەریکی جێبەجێکردنی نەخشەو پلانی خۆیەتی وا دەکات کەسام و هەیبەتی لەدڵیدوژمندا هەبێت. بەم شێوەیە دەتوانێت شارەکانی دوژمن داگیر بکات و تەخت و تاراجیان وێران بکات.

٥٦-بەبێ ڕەچاوکردنی یاسا و ڕێسا خەڵات و پاداشت ببەخشە، بەبێ گوێدانە پلانی ڕابردوو فەرمان دەربکە. ئا بەم جۆرە دەتوانیت سەرپەرشتی سوپایەك بکەیت وەکو ئەوەی لێپسراوی یەك سەرباز بیت[٢٤].

٥٧- کارو کردەوەی خۆت ڕووبەڕووی سەربازەکانت بکەوە، بەڵام هەرگیز ڕێگە نەدەیت کە پلان و مەبەستت بزانن. ئەگەر بەرئەنجامی بڕیارەکانت ئومێدبەخشبوون (بەرئەنجامەکە) بۆ هەموو سەربازەکان ئاشکرا بکە. خۆ ئەگەر حاڵەتەکە ناهەموار و لێڵ بوو هەر هیچ بە کەس مەڵێ.

٥٨-سوپاکەت ببە شوێنێکی مەترسیدار تا بەچاکی دەرباز بن. بەرەو جەرگەی بێ ئومێدیان ببە تاکو بەسەلامەتی لێی دەربچن.

٥٩- هەر بەڕاستی وایە کاتێك سوپایەك بکەوێتە ناو گێژاوی مەترسی ئەوجا دەتوانێت گورزی گران بوەشێنێت و سەرکەوتن بەدەست بهێنیٚ.

٦٠- (ئەو کاتە دەتوانین) لەجەنگدا سەرکەوتن بەدەست بهێنین کەبە وریاییەوە خۆمان بۆ پلان ومەبەستی دوژمن رێکخستبێت.

٦١- ئەگەر سوربوین لەسەر گەمارۆدانی دوژمن (ئەوا سەردەکەوین) و هەر لەدوور ڕا دەتوانیین سەر لەشکری دوژمن بکوژین.



٦٢- بەوکارە دەوترێت دەستخستنی شتێك بەهۆی زۆرزانی خۆتەوە.

٦٣- هەر لەو ڕۆژەی کە فرمانی شەرکردن دەردەکەیت ڕێگاکانی سەر سنور دابخە و تۆمارە فەرمیەکان لەناو ببە و هاتووچۆی هەیتە نهێنییەکان ڕابگرە[٢٥].

٦٤-لەناو هۆڵی ئەنجومەنی شەڕ بەزەبر بە تاکو بتوانی بەسەر بارودۆخەکەدا زاڵ بیت.

٦٥-ئەگەر دوژمن دەرچە و دەروازەیەکی بەکراوەیی بەجێهێشت بوو هەر بەپەلە لێی بڕۆ ژووریٚ.

٦٦-دەست بەسەر ئەو شتەی دوژمن دابگرە کە ئەو بەگرنگی دەزانێت و زۆر بەچاکی نەخشە بۆ هاتنی دوژمن دابنیٚ کە دەگاتە شەڕگە.

٦٧-بەپێی ڕێسای سەربازیی بەڕێدا بڕۆ هەمیشە خۆت بۆ شەڕی یەکلاکەرەوەی دوژمن ڕێك و ئامادە بکە[٢٦].

٦٨- لە سەرەتادا وەکو کچێکی شەرمن خۆت نیشان بدە هەتا دوژمن هەلێکت دەداتیٚ ئەوجا وەکو کەروێشکی خۆشبەز هەڵمەتیان بۆ ببە، جا دوژمن کاتی ئەوەی نامێنێت و درەنگ دەکەویٚ لەبەرەنگاری تۆدا.

<u>**تێبینی:**</u> لەبەر دوورودرێژی ئەم بەشە پوختەی ئەم بەشەمان فەرامۆش کرد.

## پەراوێزەکان:

١) لەم بەشەدا سون تزو باسی نۆ بارودۆخی شەڕ دەکات کە پەیوەستی کردوون  بە ڕووکاری زەوی و بۆ چەند هەرێمێك دابەشی کردوون .

٢) بەو هەرێمە دەوترێت بەرهەڵا چونکە سەربازان لە ماڵ و حاڵی خۆیان نزیکن دەتوانن هەر بەئاسانی بە ماڵی خۆیان ڕابگەن کەوابێ لەشەڕ سارد دەبنەوە و هەروادەکەی لەبەرچاوان بزر دەبن.

٣) بەو جۆرە شوێنە دەڵێن ئاسان چونکە هەر بە سێنایی دەتوانیـن پاشەکشە بکەین  و بۆی دەرچین.

٤) کە سوپا بەو خاڵە گەیشت کەوتۆتە شوێنێکی مەترسیدار دەبێت لە خۆی وریا بێت.

٥)  هەرێمی مەترسیدار لە بەندی (٧) باس کراوە، بەڵام ئەو بەندە دژی ڕێسا ڕەوشتیەکانە چونکە تۆ لەناو خاکی دوژمن دا بیت هەرگیز شیاو نییە دەست بە جەردەیی و ڕێگری بکەیت، بەڵکو نەرم و نیانی تۆ دەبێ وا لەخەڵکی بکات  بێنە ناو ڕیزەکانی تۆ و ڕەگەڵ تۆ بکەون .

٦) چونکە شەڕ لە شوێنی بێ هیوایی وا لە سەرباز دەکات بەهەموو هێزو توانای شەڕ بکات تا ئەستێرەی بەختی لە ئاسۆ دەرکەوێ .

٧) مەبەست لێی: نەرم و نیان بە و تێژ و پڕیان بکە. لە کاتی نەخۆشی و برینداری چارەسەری بە پەلەیان بۆ پەیدا بکە و لە غەمیاندا بە. با چاو لە دەستی کەس نەبن و زەبون نەبن .

٨) نابێت سەرکردە بهێڵێت ئەفسانەی بێ بنەما بڵاوببێتەوە چونکە هەندێ ئەفسانە و چیرۆکی هەڵبەستە بێهیوایی و ترس و بیم دروست دەکەن. هەروەها نابێت سەرکردە لێبگەڕێ جادوو و ئەستێرەگەری و بەخت گرتنەوە لە نێوان سەربازان سەرهەڵبدات. چونکە لەو کاتە هێزی عەقڵ و ژیری دەوەستێت.

٩) کەواتە سەرباز پێش ئەوەی سەرباز بێت مرۆییێکی ئاساییە حەزی لە تەمەنێکی پڕ فەڕ و پیتە هەروەها حەزی لە ڕەنگ و خەمڵی ژیانە .

١٠) ئەو فرمێسکانە ئاماژەی دڵسۆزی و هیمەتی سەربازانە.

١١) چوان چوو و تساو کوێی: دوو جەنگاوەری هاودەمی سون تزو بون.

١٢) شوای جان: ئەم وشە چینییە واتە خێرا و لە پڕ. ئەم جۆرە مارەش چونکە ئەم سیفەتانەی لەکاتی پەلەمار تێدایە بۆیە ئەم ناوەی بەسەردا براوە. لەم سەردەمەی ئێستا هاو واتای موناوەرەی شەڕە .

١٣) واتە: ئەگەر دوو سوپای نەیاری یەکتر توشی مەترسییەك بن یارمەتی یەکتر دەدەن و دەستباری یەکتر دەکەن ئەدی چۆن بەشەکانی سوپایەك کە هەمان ئامانج و خواستیان هەیە یارمەتی یەکتر نادەن؟

چەندەها سوپا بەهۆی پچڕانی پەیوەندی لە نێوانیاندا توشی هەرەس بوون .

١٤) ئەسپ هۆی ڕاکردنی سەربازان بووە لەسەردەمی سون تزودا. کەواتە بە پێی بۆچونی سون تزو ئەوەی وا لە سەرباز دەکات ڕانەکات بیروباوەڕێکی پتەو و پابەندی ئەوە بە بەرنامە و ڕەوتی شەڕەکە.

١٥) سون مەبەستی ئەوەیە: کە هێزی لاواز لەو شوێنانە جێگیربکەین کە شوێنێکی پارێزراو و تۆکمە بن کە ئەگەری شەڕیش لێیان کەم بێ وە کەسانی بەهێز لەو شوێنانە دا بنێین کە مەترسیان لەسەر زۆرە و ئەگەری هێرش لەسەریان پترە .

١٦) مەبەست لەبێئاگایی ئەوەیە کە تەنانەت ئەفسەران و سەربازەکانی خۆشی هەموو کون و کەلەبەرەکانی پلانەکانی نەزانن نەوەکو بەهۆی سیخوڕانەوە پلانەکان ئاشکرابن، ئەوجا ئەگەر پلانەکانت ئاشکرابوو چت بەسەر دێ!

١٧) گۆڕانکاری لەپلان زۆر پێویستە چونکە نابێت پلانێك لە جارێك زیاتر بەکاربهێنیت.

١٨) واتا نەخشە ڕێگایەکی جەهەنەمی وا دابنێیت کە سوپاکەت نەتوانن ڕابکەن یا بیر لە پاشەکشە بکەنەوە. وەکو سوتاندنی کەشتیگەل لەلایەن تاریقی کوری زیاد لە کاتی ڕزگارکردنی ئەندەلوس. ئەم سەرکردەیە بە سەربازەکانی خۆی ڕاگەیاندبوو: دوژمن لە پێشتانە و دەریاش لە دواتانە (بیر لەهیچ مەکەنەوە).

١٩) واته: دوای تاكتیك و فرِوفێڵ و جولانەوەو ڕاهێنان، بەرەنگاری وڕوبەروبونەوە دەست پێدەكات بۆیە لەسەر سوپاسالار پێویستە بەپەلە ریزەكانی سوپاكەی ڕێك بكات و خۆی بۆ شەر ئامادە بكات.

٢٠) لەو جۆرە شوێنانە دەبێت زۆر بەپەلە ئەوەی دەتەوێت بەدەستی بهێنیت و لەرِیٚ برِیندا تەتەر بیت.

٢١) تاوەكو لەگەڵ پێشرەوی سوپاكەمدا نێوانیان زۆر نەبێت لە یەك كاتدا ئەو دوو بەشەی سوپاكە بگەنە شوێنی مەبەست.

٢٢) ڕاڤەی ئەم دێرە ئەوەیە: ڕێی پاشەكشێ دەگرین تاوەكو پارێزگاری لە شوێنی خۆمان بكەین. بەڵام مەبەستی سەرەكی ئەوەیە كە دەبێت بروسك ئاسا هەموو ڕێ و ڕێبازێكی دوژمن بگرین و ڕێگایەكی دەربازبوون بۆخۆمان بهێڵینەوە.

٢٣) تێكشكاندنی ریزەكانی دوژمن جگە لەوەی تۆ بەهێزتر دەكات و دوژمنەكەت دەترسێنێت وا لە هاوسێیەكانی دوژمنەكەشت دەكات نەوێرن یارمەتی ئەو دوژمنەت بدەن خۆ ئەگەر هاوسێیەكانی دوژمنەكەت ترسان، هاوپەیمانانی دوژمنەكەت زراویان لەترسان دەرِژێت.

٢٤) پاداشتی سەربازی بەجەرگ و ئازا بكە و گوێی ترسنۆك و هەڵاتوان بگرە!

٢٥) لەدەقە وەرگێرِاوە عەرەبییەكاندا مانای ئەم بەندە بەم شێوەیە: لەو رِۆژەی (كە سەر لەشكری دوژمن دەكوژی و سەركەوتن بەدەست دەهێنی جڵەوی سەركردایەتی وەردەگری) هەموو رێگاكانی شەرِگەكە

دابخە و هاتووچۆ مەهێڵە و هەموو هەتیەکانی ناوخۆ و دەرەکی لەکار ڕابگرە. (emissary: هەیتە)

٢٦) لەبەر ئەوەی سەرکەوتن تاکە ئامانجی شەڕە هەربۆیە دەبێت جۆرەها نەخشە و پلانی شەڕ بخەیتە پێش چاوی خۆت و بیریان لێبکەوە تەنانەت واز لە نەریتە کۆن و دووبارەکانی شەڕ بهێنە.



## بەشی دوازدەهەم

# هێرشکردن بە ئاگر




Figure 4-21 Attack by fire

١–سون تزو وتویەتی: پێنج ڕێگە هەیە بۆ هێرشبردن بە ئاگر:

١– سوتاندنی سەرباز هەر لە سەربازگەکەی خۆیدا.

٢– سوتاندنی کۆگەکانیان[1].

٣– سوتاندنی کەلوپەل و هۆیەکانی گەیاندن.

٤– سوتاندنی جبەخانە و ئەمباری ئازوخەو تەقەمەنی.

٥– هاوێشتنی چەپەگڕ بۆ ناو دوژمن[2].

٢-بۆ ئەوەی بە ئاگر هێرش بکەیت دەبێت کەلوپەلی گونجاوت لەبەر دەست بێت. ئەو مادده و کەلوپەلانەی کە بۆ هەڵدانی ئاگر بەکار دێن، دەبێت ئامادەبن بۆ ئەو کارە.

٣- وەرزی گونجاو بۆ هێرش کردن بەئاگر هەیە، ڕۆژی تایبەتیش بۆ ئاگری گەورە و بەتاو هەیە

٤-وەرزی گونجاو ئەو کاتەیە کــە کـەش و هەوا وشك و برینگە. ڕۆژی تایبەتیش ئەو ڕۆژانەن کە مانگ حەوتەمین شەو (ڕۆژی حەوتەم) یاخود مانگی تابان (ڕۆژی چواردەهەم)یاخود کۆتای مانگ (ڕۆژی بیست و هەشتەم یان بیست و نۆیەم) لەو کاتانەدا با دەکەوێتە جموجۆڵ.

٥- لەکاتی هێرش کردن بەئاگر پێویستە خۆمان بۆ **پێنج ئەگەر** ئامادە بکەین کە لە وانەیە ڕوو بدەن.

١.کاتێك ئاگر ناو جەرگەی سەربازگەکە هەتا دەوروبەری سەربازگەکەشی داگرت. پـێویستــە بـێ یـەك و دوو لـە دەرەوەی سەربازگەکە هێرش بکەین.

٢.کاتێك ئاگرەکە لەهەموو لایەکی سەربازگەکە بڵاوبۆوە کەچی سەربازانی دوژمن هیچ تێکنەچوون و لەسەرخۆبوون چاوەڕوانی کاتی گونجاو بکە و هێرش مەکە[٣].

٣.ئەگەر ئاگرەکە بڵێسەی داو دەستی لەگەڕوی دوژمن نا، ئەوجا ئەگەرگونجا هێرش بکە،خۆ ئەگەر نەگونجا لەجێی خۆت مەجوڵێ(٤).

٤.ئەگەر دەکرێ لەدەرەوەی سەربازگەی دوژمن هێرش بکەیت (بە ئاگر ) چاوەڕێی ئەوە مەکە هەتا ناو سەربازگەکەش دەسوتێ. بەڵکو ئەگەر کاتی گونجاو هاتەپێش ئاوی لێمەخۆوەو هێرش بکە(٥).

٥.لەو لایەوە چەخماخەی ئاگر لێبدە کە ڕووەو بایە، هەرگیز بەرەو ئەو لایە هێرش مەکە کە با بۆی هەڵدەکات.

١١–ئەو بایەی کە لەڕۆژدا هەڵدەکات بۆماوەیەکی زۆر بەردەوام دەبێت بەڵام شنەبای شەوان زوو دەوەستێت.

١٢– لەهەموو سوپایەکدا دەبێت ئەو پێنج پێشڤەچونەی کە تایبەتن بە هێرشکردن بە ئاگر بەچاکی بزانرێت، دەبێت هاتووچۆی ئەستێرانیش بەچاکی لێکبدرێتەوە هەروەها دەبێت ئاگاداری کات بین تادەگەینە ڕۆژێکی گونجاو(٦).

١٣- ئەوکەسانەی کە ئاگر بۆ فریای خۆیان بەکاردەهێنن (بۆ هێرشکردن) زیرەکی و بلیمەتی خۆیان نیشان دەدەن وە ئەو کەسانەش ئاو بۆ یارمەتی خۆیان بەکاردەهێنن ئەوپەڕی هێزیان بەدەست هێناوە.

١٤- لەوانەیە لە بەکارهێنانی ئاو کۆسپ لە پێش دوژمن دروست بکەین بەڵام ناتوانیین دەست بەسەر هەموو سەروماڵیان دابگرین[٧].

١٥-ئای ئەو کەسە چەند بەدبەختە! کە هەوڵ دەدات لەشەڕدا براوە بێت و سەرکەوتن لە هێرشەکان بەدەست بهێنێ بەبێ ئەوەی گەشە بەگیانی هەوڵ و هیمەتی سەربازانی بدات (بەبێ ڕۆحی هەوڵ و تێکۆشان ) هەموو هێرشبردنێك کات بەفیڕۆدان و بە هەدەردانی هەوڵ و ماندوبونە.

١٦- وتەیەکی جوان هەیە دەڵێت: فەرمانڕەوای زانا و چاوکراوە هەر زوو نەخشە و پلانی خۆی دادەنێت. سوپاسالاری چاکیش پەرە بە سەرمایەی وڵات دەدات.





١٧- هەتا هەلێکی چاکت بۆ هەڵنەکەوێ مەبزوێ. هەتا سود و کەلکێك بەرچاو نەبێت سەربازەکانت مەجولێنە. هەتا هەلومەرجەکە پڕ مەترسی نەبێت شەڕ مەکە.

١٨- نابێت پاشا بەس لەبەر ڕك وتوڕەبونی خۆی سەربازانی (بێ گونـاه و بەستەزمان) بنێرێتە بەرەی جەنگ. نابێت سوپاسالاریش تەنها لەبەر پەستی و تۆرانی خۆی سەربازان ڕاپێچی بەرەی شەڕ بکات[٨].

١٩-ئەگەر بارودۆخەکە لە سود و کەڵکی تۆدا بوو پێشڕەوی بکە. خۆ ئەگەر ئاواش نەبوو هەر لە جێی خۆت بمێنەوە.

٢٠- بە تێپەربونی کـات تـوڕەیی دەبێتە دڵکرانەوە، پـەستی وبێزاریش دەبێتە ئاسودەیی و خۆشی.

٢١-لەو کاتەی کەسەراپای شانشینێك(وڵاتێك) تەخت و وێران بوو هەرگیز وەکو جارانی خۆی لێنایەتەوە، هەروەکو چۆن مردوانیش هەرگیز ژیانێکی نوێ و تازەیان بەبەردا ناکرێت[٩].

٢٢-هەربۆیە پاشای زیرەك و زانا دەبێت وریا بێت و سوپاسالاری چاکیش دەبێت ئاگادار بێت هـەر زوو بـڕیاری شەڕ نەدەن) ئا ئەمە تاکە ڕێگایە تاکو وڵات لەئاشتی و ئاسایی وتەنایی و تەبایی دابێت و سوپاش سەلامەت و ساخلەم بێت.

## پوختەی وتە:

١-پێنج ڕەوشی هێرشبردن بەئاگر هەیە.

٢-کات و ساتی گونجاو هەن بۆ هێرشبردن بە ئاگر تا ڕۆژی خۆی نەیەت پەل بزاوتی مەکە.

٣-فەرمانڕەوای دانا و چاك بیر لەو شەڕە دەکاتەوە و پرس و ڕای هەموو لایەك وەردەگرێت ئەوجا بڕیاردەدات. سەرلەشکری چاك هەتا مەفایەك (قازانج ) وەبەرچاو نەگرێ دەست بە شەڕ ناکات و ئۆردوەکەی(سوپا) بەرەو نەبەردیەکی پوچ نابات.

٤-کەسی زانا وتووێژو ڕێکەوتن دەکا.پیاوی نەزانیش دەچێتە شەڕ.

٥-هەرگیز ناتوانیت بەسەر دوژمنەکەت زاڵ ببی هەتا هەلی لێوەرنەگریت.



## پەراوێزەکان:

١) كۆگەی خواردەمەنی و ئازوخە و پیتاك.

٢) چەپەگڕ: تۆپەڵە ئاگر و تیری ئاورین... هتد

٣) بەزۆری مەبەست لەهێرشی بە ئاگر دروستکردنی پشێوی و هەڵلایە لە نێو ڕیزەکانی دوژمندا. خۆ ئەگەر دوژمن بەئاگر نەترسا دەبێت وریا بیت! دیارە ئەوان خۆیان ئامادە کردوە.

٤) ئەگەر زانیت هەلێکت هاتۆتە بەردەم بیقۆزەوە. خۆ ئەگەر توشی بەلآیەك بووی لەشوێنی خۆت بمێنەوە.

٥) ئەگەر ئاگر لە سەربازگەی دوژمندا پەیدا نەبوو چاوەڕێ بە هەتا ئاگرەکە سەربازگەکە دادەگرێ.

٦) لەسەردەمانی کۆندا لەناو هەموو میللەتان و میللەتی کوردی خۆشمان ئەژماریان بۆ هەموو وەرز و مانگ و هەفتەیەك هەبوو ناوی تایبەتیشیان بۆ هەر هەفتەیەك لەو وەرزانە دانابوو بۆ نمونە: پیرێژنە بەفالێ، خدر و ئەلیاس، مەریەم وئۆغەن...هتد. ئەوجا بەو ئەژمارکرنە دەیانزانی کەش و هەوای ئەم هەفتەیە چۆن دەبێت و هەفتەی داهاتوو چۆن دەبێت؟ (وەرگێڕ)

٧) هەرچەندە ئاو کاریگەری زۆری هەیە بەڵام بۆ وێرانکردن هێندەی ئاگر کاریگەری نییە.

٨) کەواتە هەتا دەکرێت لەشەڕ دوور بن و خۆ دوورە پەرێز بگرن ژیان شیرینە با بە شەڕ تێکی نەدەین وتراوە ئاگر سورە لەخۆم دوورە.

٩) بەڵکو دەبێت لەپێناو حەق ونیشتماندا بچینە شەڕەوە نەك لەبەر مەبەستی کەسی.

# بەشی سێزدەیەم

## بەکارهێنانی سیخوڕ



١-سون تزو وتویەتی: کۆکردنەوەی سەد هەزار سەرباز و بەڕێکردنیان بۆ ڕێگایەکی دوور زۆر لەسەر خەڵك دەکەوێت و سەرمایە و گەنجینەی وڵات لوش دەکات. تێچوی هەر ڕۆژێك خۆی لە هەزار ئۆنسە زیو[1] دەدات. ئاژاوە و پشێوی ناوخۆ و دەرەوەش لەولاوە بوەستێ. سەربازان لەبەر ماندویەتی لەسەر ڕێیان دەکەون . زیاتر لە حەوسەد هەزار خێزان ئیش وکاریان لەدەست دەدەن.

٢- لەوانەیە دوو سوپای نەیار بۆماوەی چەند ساڵ ڕووبەڕوی یەکتر ببنەوە لە پێناو سەرکەوتن خەبات بکەن. کەچی سەرکەوتنیش لە تاکە ڕۆژێك یەکلا دەبێتەوە. بەمشێوەیە بێت، ئەوپەڕی نامرۆڤایەتییە بە بارودۆخی دوژمن ئاگادار نەبیت.

٣- ئەو کەسەی بەم شێوازە ڕەفتار بکات شایەنی سەرکردایەتی نییە و ناتوانێت هیچ پێشکەشی پاشا بکات و پیاوی سەرکەوتنیش نییە.

٤-بەم جۆرە، پێشەکی زانین[٢] وا لەپاشای ژیر و سوپاسالاری چاك دەکات کە بتوانن دەست لـە دوژمن بوەشێنن و سەرکەوتوو بن بەسەریاندا چونکە بەدەستهێنانی ئەو شـتانە لەلایەن سەربازانی ئاسایی ناکرێت.

٥- ئـەو پێشەکی زانینە نە لە ڕوح و نەلە خوداوەند وەرناگیریت.هەروا بەئەزمونی چەند ساڵەش نایێتە دەست، لە ژمێرکاری ئەستێرەو ئاسمانێ وەناگیرێ .

٦- تـەنها لـە ڕێگـەی سـەربـازانـەوە (سیـخوران) دەتوانین هەلومەرجی دوژمن بزانییـن.

٧-بەم جۆرە گرینگی سیخوڕمان بۆ دەرکەوت کە بەسەر پێنچ بەش پۆلێن دەبن:

١- سیخوڕی ناوچەیی (هاونیشتمانی وڵاتی دوژمن)
٢- سیخوڕی ناوخۆیی (کارمەندانی حکومەتی دوژمن)
٣- سیخوڕی هەڵگەڕاوە (سیخورانی دوژمن)

٤- سیخوڕی بەدبەخت (لەناو دەچن و دەفەوتێن، چونکە لە خاکی دوژمن کاردەکەن هەواڵی هەڵە بە دوژمن دەدەن).

٥- سیخوڕی نەمر(ئەو سیخوڕانەن بۆ ناو خاکی دوژمن نێردراون و زەحمەتە بگەڕێنەوە.)

٨-ئەگەر هەر پێنج جۆری سیخوڕ لەکاردابوون. کەس ناتوانێت پەی بە سیستەمی ڕاز و پەنهانی ئەمانە ببات. بەم کارە دەوترێت (مەزنترین تۆڕی سیخوڕی)کە لەلایەن جەنابی پاشاوە زۆربایەخدارە.

٩-مەبەست لە سیخـوری ناوچەی (بـەنـدی ٧خـاڵــی ١) کـەڵك وەرگرتنە لە زانیاری دانیشتوانی ناوچەیەك[٣].

١٠-بەکارهێنانی سیخوڕی ناوخۆ سود وەرگرتنە لە ئەفسەران و کارمەندانی سوپای دوژمن[٤].

١١- بونی سیخوڕی هەڵگەڕاوە، زاڵبونە بەسەر سیخوڕانی دوژمن تا وایان لێبکەیت بەگوێرەی ویست و داخوازی تۆ کاربکەن.

١٢-بـەکـارهـێـنـانـی سیخــوڕی بەدبەخـت ( کە تەنها خەریکی ئەنجامـدانی کـارێکن بـــە مەبـەسـتی چەواشـەکـردنی دوژمن، تا سیخوڕانمان بناسن(و هەواڵی هەڵە بە دوژمن بدەن).

١٣-سیخوڕی نەمر[٥] ئەوانەی کە هەواڵی بنکە و سەربازگەی دوژمن دەهێنن.

١٤- هەر لەبەر ئەوەیە هیچ شتێك لەكاروباری پەیوەست بەسوپا لە بوونی پەیوەندییەكی تۆكمە و پتەو لەگەڵ سیخوڕان گرینگتر نییە. نابێ كەسیـــش لەو سیخوڕانە بەخشیشی زیاتر بێت. پێویستە لە بواری سیخوڕیدا ئەوپەڕی نهێنی بپارێزی[٦].

١٥-بەبێ ژیری و كـارزانـــی و هۆشیاری ناتوانین بەشێوەیەكی باش سیخوڕ بەكاربهێنین[٧].

١٦-بە بێ دڵ و دەرونیـــكی چاك و ڕەوشتێكی پـــاك ناتوانییـن بە تەواوەتی ڕەفتار لەگەڵ سیخوڕاندا بكەین.

١٧-بەبێ هۆشمەندی و زۆرزانی، كەس ناتوانێت لە ڕاستی و دروستی ڕاپۆرتی سیخوران دڵنیا بێت.

١٨-ئامان وریابە ئامان وریابە! ئەوجا دەتوانیت لەهەموو كارێك لە هەموو بوارێك سیخوڕ بەكاربهێنیت.

١٩-ئەگەر پێش كاتی گونجاوی خۆی هەر زانیاریەكی نهێنی لەلایەن سیخورێكەوە ئاشكرا كرا، ئەو سیخوڕە و هەموو ئەوانەش كە ئەو نهێنییەیان پێ وتراوە دەبێت بكوژرێن.

٢٠-ئەوجا ئەگەر مەبەستت شكاندنی دوژمنێك یان تەخت كردنی شارێك یان كوشتنی كەسێكی دیاری كراوە. پێویستە ناوی هەموو ئەو كەسانە بزانیت كە خزمەتگوزار و كەڕەوڵ و ئێشكگری دەرگا و

پاسەوانی سوپاسالارن. پێویستە سیخوڕەکانمان بەتەواوی لە زانیاریەکانیان دڵنیابن و دروست بن.

٢١- پێوستە بەدوای ئەو سیخوڕانە بــگـەڕێیــت کـە دوژمن بۆ سیخوڕی کردن بەسەر تۆوە ناردونی. (ئەگەر ئەوانت دۆزییەوە و کەوتنە بەردەستت) بە بەرتیل و دەم چەورکردن فریویان بدە و لە دوورەدەستێك جێیان بۆ دابین بکەو خزمەتیان بکە.بەم جۆرە ئەوان دەبنە سیخوڕێکی هەڵگەڕاوە و لەخزمەتی تۆدا کاردەکەن.

٢٢-بەهۆی زانیاریەکانی ئەو سیخوڕە هەڵگەڕاوانە کە چنگ ئێمە دەکەون دەتوانیین سیخوڕە ناوچەیی و ناوخۆیەکانیش دەستەبەر بکەین (تا بۆ ئیچممە کار بکەن).

٢٣- هــەر بەپێی ئـەو زانـیاریـانەی کە هەمــانــە (کە لەلایەن سیخوڕی هەڵگەڕاوە بە دەستمان گەیشتوە) دەتوانیین وا لەسیخوڕە بەدبەختەکان بکەین کە هەواڵ و زانیاری هەڵە بە دوژمن بدەن.

٢٤-لەکۆتایشدا، بەو زانیاریانە دەتوانیین سیخوڕی نەمر بۆ حاڵەتە دیاریکراوەکان (ئەو کارانەی کە زۆر گرینگن) بەکاربهێنیین.

٢٥-تاکە مەبەست و ئامانج لەبەکارهێنانی هەر پێنج جۆری سیخوڕ دەستکەوتنی زانیاریە دەربارەی دوژمن. ئەو زانیاریانەش هەر لــە جۆری یەکـەمی سـیخوڕ دێنە دەست کە ئەویش سیخوڕی

هەڵگەڕاوەیە بۆیە پێویستە بە بەخشیشێکی زۆرەوە مامەڵە لەگەڵ سیخوڕی هەڵگەڕاوە بکەین.

٢٦-لەسەردەمانی کۆن دەیانوت: پایە و دەستەڵاتی میرنشینی (ین) بە هـۆی (ئای شی)[٨] بووە کـە لە دەرباری (هــسیا) خزمەتی دەکرد. بەهەمان شێوە پایە و مایەی میرنـشـینی (چۆ) بەهـۆی (لویانگ)[٩] بووە کەلەخزمەتی خانەوادەی (ین) کاری کردووە.

٢٧-تەنها پاشای زیرەك و سوپاسالاری ژیر ئەوپەڕی زیرەکی و بەهرەی خۆیان بە سوپا بەکاردەهێنن بەمەبەستی سیخوڕیکردن ئا بەم کارەش چ دەســتکەوتــێکی چــاکیان وەچنگ دەکــەوێ (سەرکەوتن). سیخوڕان[١٠] گرینکترین بنەمای شەڕن چونکە هەر بەهۆی ئەوانەوە سوپا دەتوانێت بجوڵێت.

**پوختەی بەشی سێزدەهەم:**

١-پاشای ژیر و سەرلەشکری شایستە ئامادەیی و ئاگاداری پێشتریان هەیە.

٢-بونی زانیاری دەربارەی دوژمن کلیلی سەرکەوتنە بۆیە بەکارهێنانی سیخور هەنگاوێکی زیرەکانە و گرینگە بۆ رۆژی سەرکەوتن و زاڵبوون.

٣-پێنج جۆر سیخوڕ هەیە: ناوچەیی، ناوخۆیی، هەڵگەڕاوە، بەدبەخت و نەمر. هەر جۆرێك لەو سیخورانە بۆ جۆرە کارێکی دیاریکراو سودی لێ دەبینرێت و شێوازی ڕەفتار کردن لەگەڵیان جیاوازە.

٤-هیچ کارێك هێندەی سیخوڕیی سەخت و زەحمەت نییە چونکە شوێنێك نییە کەدەستی سیخوڕی نەگاتێ.

٥-پاراستنی ڕاز و نهێنی پەیوەست بە سوپا و شەڕ لە هەموو شتێ گرینگترە.

٤-پێویستە زۆر بەوریاییەوە چاودێری کاروباری سیخوڕان بکرێت .

## پەراوێزەکان:

١) لە وەرگێڕانەکەی Samuel B.Griffith دەڵێت: هەزار پارچە زێڕ بەڵام لە هەموو چاپەکانی تر دەڵێت هەزار ئۆنسە زیو.

٢) پێشەکی زانین:Foreknowledge: ئاگاداربونە لە شتێك پێش بونی یان ڕوودانی.

٣) دوای داگیرکردنی ئەو ناوچەیە ئەو سیخوڕانە بەکاردەهێنرێن تاکو زانیاریمان بدەنێ و باس و خواسی دوژمنانیان لێ وەدەست بهێنین تەنانەت ئەگەر کرا داوایان لێبکەین وەکو سیخوڕ بۆ خۆمان کاربکەن.

٤) تو مو Tu mu (کە شرۆڤەکارێکی ئەم پەرتوکەیە) دەڵێت: پێویستە زۆر بەئاگابی تاخۆت لە ئەفسەر و سەربازانی دوژمن نزیك دەکـــەیتەوە. بەتایبەتی خۆت لەو پلەدارانە نزیك بکەوە کە لە پلەکەی خۆیان ڕازی نین یاخود زۆر هەڵپەرستن یاخود هەڵەیەکیان کردووە و سزادراون بۆیە دڵشکاون.

٥) سیخوڕی نەمر دەبێت کەسێکی زۆر زیرەك و بەهرەمەند و چوست و چالاك بێت زانیاری پێویستمان بۆ بهێنێت.

٦) لەسەر سوپاسالار پێویستە هۆشیار و زۆرزان بێت تا بتوانێت ڕاستی لە درۆ جیا بکاتەوەو کەسی دڵسۆز لە تەڵەکەباز جیا بکاتەوە نەوەك سیخوڕەکان دووڕوو بن و فریومان بدەن.

٧) پێویستە کەشێکی وا بسازێنین کە سیخوڕان بتوانن لە هەموو کات و ساتێکدا سەرلەشکر ببینن. سیخوڕان هەر بەسروشتی خۆیان کار بۆ ئەو لایەنە دەکەن کە بڕە پارەیەکی زیاتریان دەدەنێ. هەروا پێویستە لەڕەفتارکردن

لەگەڵ سیخوڕان زۆر وریا بین و هەردەم چاوێکت لەسەریان بێت نەوەك بۆتۆو بۆ دوژمن کاربکەن (لە ناڵ و لە بزماری بدەن).

٨) ئای شی (I chi): وەزیرێکی میرنشینی هسیا بووە.

٩) لویانگ (Lu yang): وەزیرێکی میرنشینی (chou) بووە.

١٠) چیا لین دەڵێت: سوپا بەبێ سیخوڕی نهێنی ڕێك وەکو کەسێکی کەڕو لاڵ وایە.





## تاکە کتێبی سەربازی بەزمانی کوردی!

هونەری جەنگ کتێبێکە لە نوسینی فەیلەسوفی گەورەی سەربازی سون تزووە ئەم کتێبە :

- یەکەمین کتێبی بواری سەربازییە لە جیهاندا.
- دەبێ هەر سەربازێکی ئەمریکی ئەم کتێبەی لە لا بێت و بیخوێنێتەوە.
- ئەم کتێبە بە "کتێبی ئەمر" ناسراوە و پێش دوو هەزار و پێنج سەد ساڵ نوسراوە
- بۆ زیاتر لە بیست و پێنج زمانی زیندوو وەرگێڕدراوە.
- مەنهەجی خوێندنی زۆربەی ئەکادیمیا و قوتابخانە سەربازییەکانی جیهانە.
- سەرکردە جیهانییەکانی وەکو ناپلیۆن و تۆنگ و سامۆرای بەردەوام ئەم کتێبەیان خوێندۆتەوە
- تا ئێستا چەندان کۆڕ و سمینار دەربارەی ئەم کتێبە ئەنجام دراوە.



ناوەندی ڕەها

هەولێر- بازاڕی ڕۆشنبیری - تەنیشت پارێزگــا
مۆبایل: ٠٧٥٠٤٠٦٦٦٧٤
نرخی( ٣٠٠٠)   ڕەها/Raha

1234567890

بەرگ: محمد جبار